# باڵاپۆشی

## ڕێگەیەک بۆ بەختەوەری




نووسینی
عبدالحميد البلالي

وەرگێڕانی
هیوا مەحمود جاف





دەزگای چاپ و بەخشی
نارین

دەزگای چاپ و پەخشی
نارین




# باڵاپۆشی؛ ڕێگەیەك بۆ بەختەوەری

## -١١- گومان و وەڵامدانەوەیان

نووسینی: عبدالحمید البلالي.

وەرگێڕانی: هیوا مەحمود جاف.

چاپی: یەکەم.

ساڵی: ٢٠٢٠ز.


لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (٢٧٢٢)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.






ناونیشان:
هەولێر، بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

مۆبایل:
009647504064610

وێب سایت:
www.nareenpub.com

ئیمێڵ:
nareenpub@gmail.com




نووسینی:

عبدالحميد البلالي

وەرگێڕانی:

هیوا مەحمود جاف



# پێڕست

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨﴾ الشمس: ٧-٨.

واتە: (سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی کە بە ڕێك و پێکی بەدیهێناوە.جا توانای خراپە و چاکە و خوانەناسی و خواناسی تێدا دابین کردووە).

کەوایە خوای گەورە دەروونی مرۆڤەکانی بەدیهێناوە و ئامادە باشی تیادا دروست کردووە بۆ شوێنکەوتنی ڕێگای چاکە یان ڕێگای خراپە.

هەروەها خوای باڵادەست فەرمانی پێ کردووین هاوکاری یەك بین لە شوێن کەوتنی حەق و ئامۆژگاری نێوان خۆماندا، وە ئەمەی کردووە بە سیفەتی ئەو کەسانەی کە دۆڕاو نین، وەك لە سوڕەتی (العصر)دا باس کراوە.

هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان (محمد ﷺ) ئەرکەکانمانی لە بەرامبەر یەکتردا لە ئامۆژگاریکردندا بۆ ڕوون کردوینەتەوە، وەك فەرمویەتی: (المُؤمِنُ مِرآةُ المُؤمِنِ)[1]. واتە: ئیماندار ئاوێنەی ئیماندارە و

(١) طبرانی لە (الأوسط)دا – و ئەلبانیش لە (صحيح الجامع الصغير:٦٦٣١) ڕاستی کردۆتەوە.

عەیب و ناتەواوی خۆی لە براکەیدا دەیبنێت و ئەیزانێت، وەك ئەوەی ئەو ئاوێنەیەك بێت بۆ ئەم، بەڵام ئەم ئاوێنەیە وێنە جەستەییەکان پیشان نادات، بەڵکو وێنە رەوشتیەکان پیشان دەدات، و لەبەر ئەوەی ئیسلام شوێنکەوتوانی خۆی هاندەدات و بانگیاندەکات بۆ یەکتر خۆشویستن بە وتەگەلێکی زۆر، بنچینەی ئەم خۆشەویستیەش ئاواتی چوونە بەهەشتی براکەتە و دووربونیەتی لە ئاگر. ناشکرێت کارەکە تەنها لە سنوری ئاوات خواستندا بوەستێت، بەڵکو ئەبێت هەموو هۆکارێك کە لە تواناادا بێت بەکار بهێنرێت بۆ دوور خستنەوەی براکەت لەوەی کە زیانی لێ دەدات لە دونیا و لە رۆژی دواییشدا.

لەم دەستپێکانەوە ئەم نامیلکەیە دێتە مەیدانەوە، هەروەها لە بۆچوونی ئەو خۆشەویستی و بەزەییەی کە لە ناخماندایە بۆ کچانی گەلی موسڵمانمان لەگەڵ سوربونمان لەسەر دورخستنەوەیان لەو شتانەی زیانیان پێ دەگەیەنێت لە دونیا و لە دوارۆژدا.

ئەم نامیلکەیە بۆ توێژێکی تایبەتە لە کۆمەڵگاکەمان کە ئەوانیش ئەو خوشکانەن کە بە پۆشاکی شەرعییەوە پابەند نین، ئەوەش یان لەبەر ئەوەیە نازانن بالآپۆشی ئەرك و واجبە، یان لە بەرانبەر بریق و باقی دونیادا لاوازن، یان لە بەرامبەر دەروونی خراپخواز و شەیتانی واسواسەکەردا خۆ ناگرن، یان لە بەرامبەر ئەو هاوەڵە خراپانەدا (کە خەیر و چاکەیان بۆ دۆستانی خۆیان ناوێت) لاوازن، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر...

له خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئەم وشانە بکات بە کلیلی خێر و چاکە بۆ کردنەوەی دڵە داخراوەکان و جوڵاندنی هەستە نووستوەکان و گەڕاندنەوەی خوشکە بێ لەچکەکانمان بۆ ئەو فیترەتە پاکەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ داوە.

نابێت ئەوەشم لەبیر بچێت کە سوپاسێکی زۆرم بۆ مامۆستای بەڕێزم خوشکە بەدریە عەزازمەیە لەسەر تێبینییە بەنرخەکانی بۆ ئەم توێژینەوەیە.

دامەزراوی و سەرکەوتن و ئاخرخەیری لە خوای گەورە دەخوازین.

# گومان و حەز و ئارەزوو

شەیتان لە دوو دەروازەی سەرەکیەوە روو لە مرۆڤ دەکات، ئەو دوانەش: گومان و حەزو ئارەزوون. هیچ کەسێك نیە تاوانێك ئەنجام بدات و هۆکاری تاوانەکەی لە یەکێك لەم دوو دەروازەیە بەدەر بێت، ئەم دوو هۆکارە رێگرن لەبەردەم موسڵماندا بۆ جێبەجێکردنی هەر کارێك کە ببێت بەهۆی رەزامەندی خوای گەورە و چونە بەهەشت و دوورکەوتنەوە لە ئاگر.

لێرەدا گرنگترینی ئەو گومان و حەز و ئارەزووانە دەخەینە روو:

## گومانی یەکەم:

## کپکردنەوەی وزەی زایەندی (جنسی)

ئەم گومانە دەڵێت وزەی زایەندی لە مرۆڤدا وزەیەکی گەورە و ترسناکە، ترسناکیەکەی لە دامرکاندنەوە و کپکردنەوەیدایە، زیادکردنی پەستانیش هۆکارە بۆ تەقینەوە، باڵاپۆشی ئافرەت جوانیەکەی دادەپۆشێت و لەئەنجامدا لاوان لە کپکردنەوەیەکی زایەندی ئەوتۆدا دەمێننەوە کە نزیکە لە تەقینەوە، یان هەندێکجار لە رووداوی هەتك کردن و هی تردا دەتەقێتەوە، چارەسەریش بۆ ئەم گرفتە رزگارکردنی ئافرەتە لە باڵاپۆشی (الحجاب)، تاوەکو لاوان هەناسەیەك بەو کپبونەیان بدەن و لە دواییدا تێربوونێك بۆ ئەم پێویستی یە روودەدات و ترسی تەقینەوە بەهۆی کپبوون و خنکاندنی زایەندیەوە کەم دەبێتەوە.

## وەڵامێك بۆ ئەو گومانە:

ئەم گومانە لە رواڵەتدا جێگەی خۆیەتی و عەقڵییش پێی رازیە، لەسەرەتاشەوە وا دەردەکەوێت ئەوەی ئەم گومانەی خستوّتە روو بەدوای بەرژەوەندی کۆمەڵگادا دەگەڕێت و لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا دەترسێت، بەڵام لە واقعی کارەکەدا ئەوەی ئەم پێشنیازەی هەیە و ئەیخاتە پێش چاوی کۆمەڵگا، پێشنیازەکەی هۆکارە بۆ پەیدابونی ترسێکی گەورە بۆسەر کۆمەڵگا کە هەڕەشەی داڕوخان و لێکهەڵوەشان و سەرەوژێربوونی لێ دەکات.

خۆ ئەگەر ئەمە راست بوایە ئەوا ئەمریکا و وڵاتە ئەوروپیەکان و وڵاتانی هاوشێوەی ئەوان ئەبوایە کەمترین رووداوی هەتك کردن و پەلاماردانی ئافرەت و تاوانی تری ئەخلاقی تیا رووبدایە، چونکە ئەمریکا و وڵاتانی تری ئەوروپا بایەخێکی زۆر گەورەیان بەم لایەنە داوە بە بیانوی ئازادی تاکەوە، بەڕادەیەك ئەبینیت گۆڤاری خراپ و رووت لە هەموو جێگەیەکدا دەفرۆشرێت، هەروەها بەرنامەکانی تەلەفزیۆن لەدوای سەعات دوانزەی شەوەوە پڕە لە بەرنامە و گرتەی خراپ و رووت و وروژێنەر لە رووی زایەندیەوە.

ئافرەت لەو وڵاتانەدا هەر کە هاوین هاتە پێشەوە جلەکانی فڕێ دەدات و لە لێواری دەریاکاندا بە نیوە رووتی دەگەڕێت و پیاسە دەکات، هەروەها دوکانی ڤیدیۆکان کە لەسەریان نوسراوە (تەنها بۆ لاوە باڵغ بووەکانە ـ Adults Only) لە هەموو ئەمەریکادا بڵاوبوەتەوە، لەم دوکانانەدا

شتانێك هەن سەر سپی دەکەن لە وروژاندنی زایەندی و کارە شازەکان، لێرەدا ئەو گەنجانە دەتوانن ئەو فلیمانە بەکرێ ببەن یان لەناو دوکانەکەدا ببینن، ماڵەکانی لەشفرۆشیش بەڕادەیەکی زۆر لەو وڵاتانەدا هەن و لە هەندێك لەو وڵاتانەدا لەشفرۆشەکە لە پێشەنگایەکدا پیشانی پیاوان دەدرێت ونمایش دەکرێت.

کەوایە لەدوای ئەم ئازادی و نەمانی سنورە ئەنجامەکان چۆن بوون؟ ئایا رووداوی هەتککردن کەم بویەوە؟ ئایا ئەو تێربوونە هاتە دی کە باسی لێوە دەکەن؟ و ئایا ئافرەت پارێزرا لەو ترسناکیە؟!.

## سەرژمێریە ئەمەریکیەکان:

لە کتێبێکدا کە حکومەتی فیدراڵی ئەمەریکا دەریدەکات لەژێر ناونیشانی (تاوان لە ئەمەریکا – Crime In U.S.A)، "ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرژمێری ئەم کتێبە لەلایەن حکومەتەوە متمانە پێ کراوە نەك لەلایەن کۆمپانیاکانی سەرژمێرکردنەوە"، لە لاپەڕە شەشی کتێبەکەدا هاتووە: هەموو (٦) خولەك جارێك تاوانێکی هەتککردنی بەزۆر لە ئەمەریکادا روو دەدات (ئەمە باس لە ساڵی ١٩٨٨ دەکات!)، هەتککردن بەزۆر واتە لەژێر کاریگەری چەکدا، لەهەمان کتێبدا ئەم سەرژمێریانە خراونەتە روو:

- لەساڵی (١٩٧٨) دا ژمارەی حاڵەتی هەتککردن لە ئەمەریکادا گەیشتۆتە (١٤٧.٣٨٩) حاڵەت.

- لەساڵی (١٩٨١) دا ژمارەی حاڵەتی هەتککردن لە ئەمەریکادا گەیشتۆتە (١٨٩.٠٤٥) حاڵەت.
- لەساڵی (١٩٨٣) دا ژمارەی حاڵەتی هەتککردن لە ئەمەریکادا گەیشتۆتە (٢١١.٦٩١) حاڵەت.
- لەساڵی (١٩٨٧) دا ژمارەی حاڵەتی هەتککردن لە ئەمەریکادا گەیشتۆتە (٢٢١.٧٤٦) حاڵەت.

## ئایەتێك تەفسیری ئەو سەرژمێریە دەكات:

ئەم سەرژمێریەو هەر هەواڵێکی متمانە پێکراوی لەم جۆرە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی تاوانی زایەندی (جنسی) لەو وڵاتەدا، ئەمەش وەك تەفسیرێکی کردەییە بۆ ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾﴾ الأحزاب: ٥٩.

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیمانداران بفەرموو: کە بە پۆشاکی باڵا پۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (توشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (لە کەم و کووڕی ڕابوردووتان خۆش دەبێت))

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەش وەك ئیمامی قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا باسی دەکات" ئافرەتان پێش ئەوەی (ئاودەست) هەبێت دەچوونە دەشت و بیابان بۆ سەرئاوکردن، لەوێدا جیاوازی لە نێوان ئافرەتی ئازاد و کۆیلەدا دەردەکەوت، ئافرەتانی ئازاد خۆیان بە عەبایەك دادەپۆشی بۆیە دوور ئەبوون لەوەی لاوێك لێیان نزیك بێتەوە، پێش دابەزینی ئەم ئایەتە هەندێك لە ئافرەتە ئیماندارەکان کە دەچوونە دەرەوە بۆ سەرئاو هەندێك لە پیاوخراپەکان بەرەو لایان دەهاتن و وایاندەزانی ئافرەتی کۆیلەن، ئەمانیش بانگیان لێ دەکردن و ئەوانیش دوور دەکەوتنەوە، لەبەر ئەم حاڵەتە ئافرەتان شکاتیان گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت: کاتێك ئافرەتی ناپۆشتە جوانی خۆی بۆ هەموو کەسێك دەردەخات، نزیکە لەوەی ئازاری پێ بگات لەلایەن مرۆڤە گورگ ئاساکانەوە، چونکە ئەو جوانی پیشاندانە ئارەزووە شاراوەکان دەوروژێنێت... بەڵام ئافرەتی باڵاپۆش جوانی و شوێنە سەرنجڕاکێشەکانی دەشارێتەوە و تەنها هەردوو دەست و دەموچاوی (روی) دەبینرێت لە وتەیەکدا، و لە وتەیەکی تردا تەنها چاوەکانی دەبینرێت. کەوابوو ئافرەتی باڵاپۆش هیچ ئارەزوو و حەزێك ناجوڵێنێت و ناوروژێنێت، خوای گەورە باڵاپۆشی بۆ ئافرەت داناوە تاوەکو پارێزراوبێت لە ئازار و زیان، چونکە پەروەردگارمان

دەزانێت کە خۆدانەپۆشین بانگەشەیە بۆ زیادبوونی تاوانی زایەندی

بەوەی ئارەزووە متبووەکان دەجولێنێت.

بۆ ئەوانەی کە سوورن لەسەر ئەو گومانە و بەڕاستی دەزانن چوار حەقیقەت هەیە:

*حەقیقەتی یەکەم: سەرژمێریەکان بەدرۆیان دەخەنەوە.

*حەقیقەتی دووەم: ئارەزووی زایەندی لە پیاوان و ئافرەتاندا هەیە، ئەوەش نهێنیەکی خواییە و لە ئافرەتان و پیاواندا بەدیهاتووە لەبەر چەند حیکمەتێکی زۆر، لەوانە:

بەردەوام بوونی منداڵ و وەچە، با پێکەوە خەیاڵ بکەین گەر ئەم ئارەزووە زایەندیە نەبوایە چۆن نەوە لەدوای نەوە دەهات؟ و هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت ئەم ئارەزووە بوونی نیە و داوا لە پیاو بکات کە ئاسایی مامەڵە لەگەڵ ئەو دیمەنانەدا بکات.

*حەقیقەتی سێیەم: ئەوەی پیاو ئەوروژێنێت بینینی جوانی ئافرەتەکەیە ئەگەر دەموچاوی بێت یان شوێنە وروژێنەرەکانی تری، و ناتوانێت بە پێچەوانەی ئەو فیترەتەی کە خوا پێی داوە ئارەزووەکەی بە بینینی شوێنی وروژێنەر کپ بکاتەوە.

*حەقیقەتی چوارەم: ئەو کەسەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە زیادکردن و بڵاوکردنەوەی دیمەنی رووت و وروژێنەر چارەسەری کپ بوونی زایەندی دەکات بەوەی تێربوون دروست دەبێت، ئەو کەسە بەو بانگەشەیە دەگاتە دوو ئەنجام:

یەکەم: ئەو پیاوانەی کە حەز و ئارەزووی شوێنە دیارەکانی لەشی ئافرەت نایان وروژێنێت، ئەوانە کەسانێکن خەسێنراون بۆیە ئارەزووی زایەندیان نەماوە و هەست بە هیچ شتێك ناکەن.

دووەم: ئەو پیاوانەی کە شوێنی دیاری لەشی ئافرەت نایان وروژێنێت ئەوانە توشی نەخۆشی ساردی زایەندی بوون، ئایا ئەوانەی بانگەشەی راستی ئەم گومانە دەکەن دەیانەوێت پیاوانی ئوممەتەکەی ئێمە لە یەکێك لەو دوو پۆلەی پیاوان بن؟!.

## گومانی دووەم:

## بێ قەناعەتی

ئەمە زیاتر لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەوە نزیکترە تاوەکو گومان، چونکە ئەگەر لە یەکێك لەو خوشکە بەڕێزە بێ لەچکانە بپرسیت: هۆی چیە پابەند نیت بە بالآپۆشیەوە؟ لە وەلامدا دەڵێت: "وەڵاهی جارێك قەناعەتم بەرامبەر بە بالآپۆشی بۆ دروست نەبووە، هەرکاتێك ئەو قەناعەتەم بۆ دروست ببێت بەیارمەتی خوا بالآپۆش دەبم".

هەر خوشکێك ئەم گومانە وەك بیانویەك بەکاربهێنێت ئەبێت جیاوازی لە نێوان دوو فەرماندا بکات، کە ئەوانیش فەرمانی خوایی و فەرمانی مرۆڤین... خۆ ئەگەر فەرمانەکە قسەی مرۆڤ بێت، ئەوا مرۆڤەکان بە گشتی راست دەکەن و هەڵەش دەکەن، وەك ئیمامی مالیك دەڵێت: "هەموو کەسێك دەکرێت هەندێك قسەی بەڕاست بزانین و لێی وەرگرین و هەندێك قسەشی بەڕاست نەزانین و لێی وەرنەگرین تەنها خاوەنی ئەو گۆڕە نەبێت (مەبەستی رسول الله ﷺ بوو)".

کەواتە ئەگەر فەرمانەکە لە ریزی قسەی مرۆڤەکاندا بێت، واجب ناکرێت لەسەر کەس پابەند بێت بەو فەرمانەوە، لێرەدا هەر مرۆڤێك بۆی هەیە بڵێت من قەناعەتم بەم قسەیە نیە و کەسیش رەخنەی لێ ناگرێت.

بەڵام ئەگەر ئەم فەرمانە لە فەرمانە خواییەکان بێت، واتە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا فەرمانی پێ کردبێت، یان فەرمانی بە پێغەمبەرێك کردبێت کە بە ئوممەتەکەی خۆی بگەیەنێت، ئەوە لێرەدا بوار بۆ هیچ کەسێك نیە بڵێت: (من قەناعەتم نیە). وە ئەگەر وتەی کەسەکە (پیاو بێت یان ئافرەت) لە دڵەوە بێت و بشزانێت کە فەرمانەکە لە کتێبی خوادا هاتووە، ئەوا توشی مەترسی دەرچوون لە ئوممەتی ئیسلام دەبێتەوە بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، چونکە ئەو قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کە باوەڕی بە کتێبەکەی خوا نیە و گومانی لە فەرمانەکە هەیە، ئەمەش ترسناکترین وتەیە، خۆ ئەگەر بڵێت من لە خوا یاخی بووم، یان بڵێت من دەرەقەتی هەوا و ئارەزووەکانم نایەم و دەروونم لاوازە، یان بڵێت ئیرادە و توانام لاوازە، ئەم هەموو وشانە و هاوشێوەکانی ئەوەندەی وشەی (قەناعەتم نیە) قورس نیە، چونکە ئەم وشانەی دوایی وشە گەلێکن نیشانەی دانپیادانن بە هەڵە و لاوازی و یاخی بوونی کەسەکە،وە خۆی ناکات بە دادوەر بەسەر فەرمانەکانی خواوە و هەرچیەکی بوێت بەڕاستی بزانێت و هەرچیەکی نەوێت بە هەڵەی بزانێت، ئەوەی بیەوێت وەریبگرێت و ئەوەشی نەوێت وەری نەگرێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا

أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ﴿٣٦﴾ الأحزاب: ٣٦.

واته: (نەبۆ هیچ پیاوێکی باوەڕدار یان ئافرەتێکی باوەڕدار نییە، کاتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیار لە شتێك بدەن و ئەوان سەرپشك بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە یان نەکردنی، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواو)

## هەڵوێستێکی پێویست:

کاتێك بەندەکانی خوا ئیمانیان بە خوا هێناو باوەڕیان بەوە هەبو کە خوا لەوان داناتر و زاناترە، نابێت بە ئارەزووی خۆیان فەرمانەکان وەربگرن. بەڵکو پێویستە لەسەر ئیماندار (پیاو بێت یان ژن) کاتێك گوێی لە فەرمانێکی خوایی دەبێت وەك هەموو ئیماندارەکان بڵێت: ﴿وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ البقرة: ٢٨٥.

واتە: ( پێغەمبەر و ئیمانداران وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام و گەڕانەوە هەر بۆ لای تۆیە.)

کاتێك خوای گەورە فەرمانێکمان پێ دەکات دەزانێت ئەوە لە بەرژەوەندی ئێمەدایە و هۆکارێکە بۆ ئاسودەییمان، وە کاتێك خوای گەورە باڵاپۆشی لەسەر ئافرەت واجب دەکات دەزانێت ئەم فەرمانە هۆکاری ئاسودەیی و رێز و سەربەرزیەتی.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە خۆی زانایە و زانینەکەی هەموو ڕوو و بوارەکان دەگرێتەوە، ئەزانێت پێش دروست بوونی مرۆڤ چی بووە، و لە ئایندەشدا چی دەبێت بە بێ دیاریکردنی سنورێك بۆ ئەو زانین و زانیاریە، وە ئەو روداوانەش دەزانێت کە هێشتا روویان نەداوە و ئەگەر رووش بدات چی ئەبێت و چۆن ئەبێت، و لەبەردەم ئەم باوەر بونەدا کە ئێمە وەك موسڵمانێك باوەڕمان پێیەتی، ئایا گونجاوە پشت لە وتەی خاوەنی ئەم هەموو زانین و زانیاریە بکەین و وتەی کەسانێك لە مرۆڤەکان وەربگرین کە زانستەکەیان کەم و سنوردار و ناتەواوە.

**نمونەیەك لە واقیعدا:**

نمونەیەکت لە واقیعدا بۆ ئەهێنینەوە... ئەڵێین: ئێمە ئەگەر ئامێرێکی کۆمپیوتەر بکڕین، ئەوەشی کە دروستی کردوە خۆشی لەگەڵماندایە و خۆی ئەزانێت چۆن کار ئەکات و لە ئەلفەوە تا یا شارەزایە تیایدا، ئایا گونجاوە کە کەسێك کارەکەی شۆردنی ئۆتۆمبێلە بانگ بکەین بۆ ئەوەی فێرمان بکات چۆن ئەم ئامێرە بەکار بهێنین؟!! هیچ عاقڵێك ئەمە ناڵێت، بەڵکو عەقڵ پێمان دەڵێت کە کەسی پسپۆڕ بەو ئامێرە بانگ بکە تاوەکو چۆنیەتی ئیشکردنەکەیمان بۆ روون بکاتەوە، هەروەها چۆنیەتی چاککردنەوەی ئامێرەکە ئەگەر خراپ بوو.

ئەوەش کە مرۆڤەکانی دروست کردووەو بەدی هێناوە، ئەوە خوای بەندەکانە، بۆیە ئاساییە ئەو لە هەموو کەس زاناتر بێت لەو شتانەی کە سود یان زیانیان پێ دەگەیەنێت، هەروەها هەموو گوێڕایەڵیەك و دادوەریەك وملکەچ بوونێك بۆ غەیری خوای گەورە جۆرێکە لە شێتی و نەفامی و گێلی، نەفامیەکە هۆکارەکەی ئەوەیە بۆ کەسێك گوێڕایەڵن کە نازانێت، کەسێکیش ئامۆژگاری لە نەفام و نەزانێکەوە وەربگرێت ئەوا خۆشی توشی تیاچوون دەکات.

زۆر بەداخەوە ئەمە بەسەر ئێمەی موسڵماندا روویداوە، ئەویش چونکە ئێمە داوای وەڵاممان لە کەسێك کردووە کە وەڵامەکەی لەلا

نیە، هەروەك چۆن زۆرێك لە ئێمە نازانێت وشەی (ئیسلام) مانای چیە؟ کە تەسلیم بوون و ملکەچی تەواوە بۆ فەرمان و نەهیەکانی خوای گەورە.

## خوشكی داوێنپاکم نەکەویتە نێو داوی بۆچوونە دژ بە یەکەکانەوە:

کاتێك ئامۆژگاری هەندێك لەو خوشکە بەڕێزە بیّ لەچکانە دەکەیت، یەکێکیان رووت تێدەکات و دەڵێت: : من موسڵمانم و ئیماندارم و نوێژەکانم ئەنجام دەدەم لە کاتی خۆیدا و هەندێك نوێژی سوننەتیش دەکەم، مانگی رەمەزان بەڕۆژوو دەبم و حەجیشم کردووە و زیاتر لە جارێکیش عەمرەم کردووە، مانگانەش بەشدارم لە هەندێك پرۆژەی خێرخوازیدا، بەڵام قەناعەتم بە باڵاپۆشی (حجاب) نی یە.

**بەم خوشکە بەڕێزە دەڵێین:**

گەر ئەو کردەوە و پەرستشانەی پێی هەستاویت و ئێستاش بەردەوامی لە ئەنجامدانیدا لە ئیمان و تەسلیم بوون بە فەرمانەکانی خواوە سەرچاوەی گرتووە، وە لە ترسی سزای خوایی وازت لەو واجبانە نەهێناوە، کەوایە لەبەرچی ئیمانت بە هەندێکیان هەیە و

ئیمانت بە هەندێکی تریان نیە لە کاتێکدا سەرچاوەی فەرمانەکە یەك سەرچاوەیە.

هەر وەك چۆن ئەو نوێژەی ئەنجامی دەدەیت بە دەقی کتێبەکەی خوای گەورە واجبە، ئاوەهاش بالاپۆشی واجبە و گومان لە واجب بوونیدا لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ نیە.

ئایا سەرزەنشتی خوای گەورەت نەبیستوە بۆ نەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەنجامدانی هەندێك لە فەرمانەکانی خوا و وازهێنان لە هەندێکی تریان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥ ﴾ البقرة: ٨٥.

واتە: (مەگەر دەشێت باوەڕتان بە بەشێکی (کتێبی خوا) هەبێت و بێباوەڕبن بەبەشێکی تری ؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان کە ئەوکارە دەکات جگە لەسەر شۆڕیی و سووکی نەبێت لە ژیانی دنیادا هیچی تر هەیە؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوای گەورەیش بێ ئاگانیە لەو کارانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن.)

کێ ئەوەی لە یادە کە لە فەرمودەیەکی راستدا هاتووە (إنَّ أهْوَنَ أهْلِ النَّارِ عَذابًا يَومَ القِيامَةِ رَجُلٌ، علَى أخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتانِ، يَغْلِي منهما دِماغُهُ كما يَغْلِي المِرْجَلُ والقُمْقُمُ)[1].

واتە: سوکترین ئازاری دۆزەخ لە رۆژی قیامەتدا پیاوێکە دوو ئەسکڵ لە ژێر پاژنەی پێکانیدایە و لە تاواندا مێشکی دەکوڵێت.

گەر ئەم کەسە لەوانە بێت کە کەمترین ئازار دەدرێت لە رۆژی قیامەتدا، ئەی ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە خوای گەورە هەڕەشەی توندترین سزای لێ دەکات وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە کەوا ئیمانی بە هەندێکی هەیە و وازی لە هەندێکی تر هێناوە.

خوشکی ئازیزم..

لە پێناو رواڵەتی دەرەوە و شانازی کردن بە مۆدێلی دونیاییدا دوا رۆژی خۆت دەفرۆشیت، وە خۆت بۆ بەرگەگرتنی ئەم تۆڵە و سزا توندە ئامادە دەکەیت؟ ئێمە هیوای هەموو خێر و چاکەیەکت بۆ دەخوازین لە دونیا و لە دوارۆژیشدا، وە داوات لێ دەکەین عەقڵ و هۆشی خۆت بکەیت بە دادوەر لەم هەڵبژاردنەدا.

---

(١) بوخاری: (٦٥٦٢)، موسلیم: (٢١٣).

## گومانی سێیەم:

## ئیمان لە دڵدایە:

ئەگەر پرسیار لە یەکێك لەو خوشکە بەڕێزانە بکەیت: لەبەر چی بالآپۆش نیت؟

دەڵێت: "ئیمان لە دڵدایە.ئەم وەڵامە دیارترین و بڵاوترینی وەڵامەکانە لە لایەن ئەو خوشکە بێ لەچکە ئازیزانەوە، ئێمەش لەگەڵ ئەم گومانەدا هەڵوێستەیەکمان هەیە.

### سەرچاوەی ئەم گومانە:

ئەوان ئەیانەوێت تەفسیری هەندێك لە فەرمودەکان بە شێوەیەکی هەڵە بکەن، وەك ئەم فەرمودەیە کە دەفەرموێت: (إنَّ الله لا يَنظر الى صُوَرِكُم و أموالكم، و لكن يَنْظر الى قُلوبِكُم و أعمالِكُم)[1].

واتە: خوای گەورە تەماشای روخسار و سامانەکانتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات.

ئەبینیت ئەوان ئەم فەرمودەیە بۆ واقیعی خۆیان دادەبەزێنن، ئەمەش حەقێکە و بۆ مەبەستێکی ناهەقە، راستە ئیمان جێگاکەی دڵە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە نیە کە ئیمان تەنها لە دڵدا

---

(١) موسلیم (٢٢٦٤).

تـەواو دەبێـت و جێگاکـەی تـەنها دڵـە، بـەڵکو لـە فەرمودەکـەدا دەیەوێت گرنگی دڵسۆزی و ئیخلاص روونبکاتەوە لە قـەبوڵ بـوونی کردەوەکاندا، و خوای گەورە تەماشـای شـکڵ و شـێواز ناکـات وەك ملکەچـی (خشـوع) لـە نوێـژدا و لـە هەنـدێك شـوێنی تـردا، بـەڵکو تەماشای دڵ و دڵسۆزی نیـەت دەکـات کـە تـەنها بـۆ خـوای گـەورە خۆی یەکلایی کردبێتەوە.

خوای گەورە تەنها ئەو کردەوانە وەردەگرێت کە تەنها بۆ ئەو بێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (التَّقوی هاهُنا ، و یشیر الی صدره)[1].

واتە: تەقوا و پارێزکاری لێرەدایە و ئاماژەی بۆ سنگی خۆی کرد.

خـاوەنی کتێبـی (نزاهـە المـتقین) دەڵێـت: "فەرمودەکـە مەبەسـتی ئەوەیە پاداشتی کردەوە بە گوێرەی دڵسۆزی و نیەتپاکی دڵەکەیە، وە ئەبێت بایەخ بدرێت بە حاڵەتی دڵ و راسـتکردنەوەی نیەتـەکانی و پاککردنـەوەی لـە هـەموو وەسـفێکی خـراپ کـە خـوا پـێ ی ناخۆشە)[2].

---

(١) موسلیم (٢٥٦٤).

(٢) نزاهە المتقین (٢٥/١).

## پێناسەی ئیمان:

ئیمانیش تەنها لە دڵدا تەواو نابێت و بوونی ئیمان لە دڵدا بەس نیە بۆ رزگاربوون لە ئاگر و بردنەوەی بەهەشت، جەماوەری زانایانی سونەت و جەماعەت پێناسەی ئیمانیان کردووە بەوەی:

(باوەڕ هێنانە بە دڵ و وتنیەتی بە زمان و جێبەجێکردنیەتی بە کردەوە).

ئەم پێناسەیە لە هەموو کتێبەکانی عەقیدەدا دەبینیت، مەگەر لە شازەکاندا نەبێت، ئەوانەی کە لەسەر پەیڕەوی سوننەت و جەماعەت نین.

## بەو سێ شتە ئیمان تەواو دەبێت:

با وادابنێین کەسێك بە زمان ئیمانی هێناوە بەڵام بەدڵ باوەڕی پێی نیە، دەی ئەمە کاری مونافیق و دووڕووەکانە، هەروەها کەسێك بە جەستەی کردەوەکان ئەنجام بدات و بەدڵ بڕوای پێنەبێت، ئەوەش دیسان کاری دووڕوو و مونافیقەکانە، چونکە مونافیقەکان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان دەکرد و جیهادیان دەکرد و دە یانبەخشی و دەهاتن و دەچوون، بەڵام لە دڵەوە بڕوایان بە دینەکەی خوای گەورە نەبوو، خوای گەورەش حوکمی دووڕووی و مونافیقی دا بەسەریاندا، سزاکەشی نزیمترین شوێنە لەناو دۆزەخدا.

هەروەها کەسێك بەدڵ ئیمانی هەبێت و بەجەستە کردەوە نەکات، ئەمەیان ئیشی شەیتانە، چونکە شەیتان باوەڕی بە توانای خوای گەورە هەیە لە زیندوو کردنەوە و مراندندا، بۆیە داوای مانەوەی لە خوای گەورە کرد تاوەکو ڕۆژی قیامەت و ئیمانی بەو ڕۆژەش هەیە، بەڵام شەیتان بە جەستە کارەکەی ئەنجام نەدا بەگوێرەی ئیمانەکەی ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة: ٣٤.

واتە: (کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەك) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی بەم کارەی کەوتە ڕیزی کافرەکانەوە.).

ئایەتێك لە قوراندا نەهاتووە کە باسی ئیمان بکات و بەدواییدا باسی کردەوە نەکات، وە بەردەوام دەخوێنیتەوە ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ کردەوە بەستراوە بە ئیمانەوە و هەرگیز لێی جیانابێتەوە.

بەم خوشکە بەڕێزە دەڵێین کە حەزی لە باڵاپۆشی نیە و بیانوەکەشی ئەوەیە کە ئیمان لەدڵدایە، پرسیاری لێ دەکەین چی دەکات گەر بۆ نمونە ئەو مامۆستا بێت لە قوتابخانەیەکدا و بەڕێوەبەرەکەی داوایەکی لێ بکات؟ وەك نوسینی راپۆرتێك، یان ئەنجامدانی کارێك وەك سەرپەرشتی کردن، یان وەرگرتنی وانەیەکی زیادە، یان ببێتە مامۆستایەکی یەدەك لە جیاتی یەکێك

لەو مامۆستایانەی کە نەهاتووە، یان هەر داوایەکی تر، ئایا دەگونجێت و لێی قبولڵ دەکرێت گەر بڵێت من باوەڕ و قەناعەتم بە داوای بەڕێوەبەرەکە هەیە، بەڵام داواکەی جێبەجێ ناکەم. یان ئایا بەڕێوەبەرەکە ئەوەی لێ قبوولڵ دەکات؟ ئایا ئاینده و دوارۆژی ئەم مامۆستایە بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئەمە نمونەیەکە و پەیوەستە بە مرۆڤەوە... ئەی چۆن ئەبێت گەر کارەکە بە خواوەندی مرۆڤەوە پەیوەست بێت؟

نمونەی بەرز بۆ خوای گەورەیە.

## گومانی چوارەم:

## خوا هیدایەتی نەداوم:

زۆرێك لەو خوشكە بێ لەچكانە ئەم گومانە باس دەكەن بەم شێوازە: "خوا هیدایەتم بدات، حەزم لە بالآپۆشییە، بەلآم جارێك خوا هیدایەتی نەداوم، دوعا بكە خوا هیدایەتم بدات".

ئەو خوشكەی ئەم قسانە دەڵێت دەكەوێتە هەڵەیەكی گەورەوە، ئێمەش پرسیار لەو خوشكە بەڕێزە دەكەین: (چۆن خوا هیدایەتی نەداویت؟).

خۆ ئەگەر بڵێت: من ئەزانم هیدایەت نەدراوم، ئەوا ئەو خوشكە یەكێكە لەو دووانە:

یەكەم: تەماشای زانستی غەیبی كردووە لە كتێبی نادیاردا، وە لەو كتێبەوە زانیویەتی كە لەو ئافرەتە ئاخر شەڕانەیە كە دواڕۆژیان بۆناو ئاگرە.

دووەم: دروستكراوێك هەواڵی ئەو دواڕۆژەی پێ داوە كەوا ئەو لە هیدایەتدراوەكان نیە، ئەو دروستكراوەش یان فریشتەیە یان مرۆڤێكە.

خۆ ئەگەر وەلآمی سروشتی بۆ ئەم دوو گریمانە نەخێر بێت، كەوابێ چۆن زانیت كە خوا هیدایەتی نەداویت؟

ئەمە حاڵەتێکە.... حاڵەتی دووەم: خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا (کە قورئانە) روونی کردۆتەوە کە هیدایەت دوو جۆرە:

١.هیدایەتی رێنمونی.

٢.هیدایەتی خوایی.

یەکەم: هیدایەتی رێنمونی:

ئەم جۆرەیان واتە رێنیشاندان و رینمونی بۆ حەق و راستی، لەمەیاندا ئێمە وەك مرۆڤ بەشدارین لەگەڵ خوای گەورە و بەدیهێنەر و پێغەمبەراندا، کەواتە خوای گەورە لە رێگەی پێغەمبەران و کتێبەکانیانەوە رێگەی حەق و رێگەی ناحەق بۆ دروستکراوە فەرمان پێ کراوەکانی خۆی روون دەکاتەوە، هەروەها بانگخوازانیش لەگەڵ پێغەمبەراندا ئەم رێگەیە بۆ خەڵکی بە گشتی روون دەکەنەوە، لێرەدا هەموو لایەك هاوبەشە لەم کارەدا.

دووەم: هیدایەتی خوایی:

ئەمەیان تایبەتە بە خوای گەورەی تاك و تەنهاوە، ئەویش دامەزرا ندنی حەق و راستیە لە دڵەکاندا و دوور راگرتنی دڵەکانە لە تاوان و یارمەتی دانیەتی بۆ بەردەوام بوون لەسەر رێگەی حەق و دامەزراویە لەسەری، هەروەها خۆشویستنوجوانکردنی ئیمانە لە دڵەکاندا و و ناشرین کردنی کوفر و لادان و یاخیبوونە بۆ ئەوانەی

وەڵامی بانگی خوایی دەدەنەوە و شوێنی هیدایەت و ڕێنمونی ئەو دەکەون، ئەم جۆرە هیدایەتە لەدوای جۆری یەکەمەوە دێت، چونکە خوای گەورە حەق و ڕاستی پیشانی هەموو کەس دەدات، لەم ڕووەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾ فصلت: ١٧.

واتە: (هۆزی – ثمود – یشمان ڕێنموویی کرد بۆ ئیمان و چاکە" کەچی حەزیان بەکوێری کرد، تا چاوساغی و هیدایەت و ئیمان).

خوای گەورە توانای سەرپشککردنی بەخشیوە بە هەموو ئەرك پێ کراوێك لە هەڵبژاردنی ڕێگەی حەق یان ڕێگەی خراپ و ناحەقدا، خۆ ئەگەر بە ئارەزووی خۆی ڕێگەی حەقی هەڵبژارد ئەوا هیدایەتی خوایی بەدوایدا دێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾﴾ محمد: ١٧.

واتە: (ئەوانەش ڕێبازی هیدایەت و ئیمانداریيان گرتۆتە بەر بەگوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) هیدایەت و دینداریيان گەشەدەکات و پەرەدەسێنێت، خوایش شارەزایی و پارێزگاریی و دڵنیایی زیاتری پێبەخشین.).

ئەگەر بە ئارەزووی خۆی ڕێگەی ناحەقی هەڵبژارد ئەوا گومڕاییەکەی زیاتر دەکات و لە هیدایەتی خوایی بێبەشی دەکات، وەك دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ﴾ مريم:٧٥. هەروەها

دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ ﴾ الصف: ٥.

**نمونەیەك بۆ هیدایەتی خوایی:**

مامۆستا شەعراوی نمونەیەکی جوان بۆ ئەم جۆری هیدایەتە دێنێتەوە، دەڵێت: "نمونەی ئەمە وەك نمونەی پیاوێکە پرسیاری ناونیشانێك دەکات، دەگاتە پۆلیسی هاتوچۆ و پرسیاری شوێنەکەی لێ دەکات، ئەویش پێی دەڵێت: دەچیتە فلانە جادە و پێچ دەکەیتەوە بەلای راستدا و ئینجا لای چەپ و ئینجا جادەکەی تر دەگریت و باڵەخانەیەکت دێتە پێش کە رەنگەکەی وایە و ناونیشانەکە لەوێدایە".

مامۆستا شەعراوی دەڵێت: "ئەم پیاوە لەنێوان دوو حاڵەتدایە، یان ئەوەیە باوەڕ بە پۆلیسەکە دەکات و بەپێی زانیاریەکانی ئەو رێگە دەگرێت و دەڕوات، هەموو جارێك کە دەڕوات و بەردەوام دەبێت زیاتر لە شوێنەکە و دۆزینەوەی ناونیشانەکە نزیك دەبێتەوە. یان پیاوەکە دەڵێت: ئەو پۆلیسە درۆزنە. بۆیە بە پێچەوانەی قسەکانی پۆلیسەکە رێگە دەگرێتەبەر و تاوەکو زیاتر بڕوات زیاتر گومڕا

دەبێت و سەری لێ دەشێوێت، ئا ئەمەیە چیرۆکی هیدایەت و گومڕایی". [1]

ئەوە نمونەیەکی جوان بوو لە نزیککردنەوەی ئەو سوننەتە خواییە لە هزرماندا، بۆیە هەرکەسێك ڕێگەی حەق هەڵبژێرێت خوای گەورە یارمەتی دەدات و دامەزراوی دەکات، و هەرکەسێکیش ڕێگەی ناحەق هەڵبژێرێت خوای گەورە گومڕای دەکات و لەگەڵ نەفس و شەیتانی خۆیدا بەجێی دەهێڵێت.

## بەدوای ڕێگای هیدایەتدا بگەڕێ دەستت دەکەوێت:

سوننەتی خوا بەم جۆرەیە لەگەڵ دروستکراوەکانی خۆیدا ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ٤٣﴾ فاطر: ٤٣.

واتە: (ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن).

سوننەتی خوای گەورە کاتێك تەواو دەبێت و کامڵ دەبێت کە کەسەکە دەست بە گۆڕینی خودی خۆی بکات و هۆکاری ئەو

---

(١) ئەم وتەیەی لە وانەیەکدا بەناوی (ئایا مرۆڤ سەرپشکە لە ژیاندا یان نا) لە کوەیت لە هەشتاکاندا پێشکەش کردووە.

گۆڕانکاریەشی کە دەیەوێت بەکاری بهێنێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ الرعد:١١.

واتە: (بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت (لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن).

بۆیە ئەوەی ڕێگەی راست و هیدایەتی دەوێت، و داواش لە خەڵکی دەکات بۆ ئەو مەبەستە دوعای بۆ بکەن، پێویستە بەدوای هۆکارەکانیدا بگەڕێ.. بۆ ئەو مەبەستەش مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) پێشەوامانە، ئەو ئافرەتە پێویستی بە خواردنە، و لە خراپترین حاڵەتی لاوازیدایە کە ئافرەتی پێدا گوزەر دەکات ئەویش حاڵەتی منداڵبوونە، لێرەدا خوای گەورە داوای کارێکی لێ دەکات کە بە بەهێزترین پیاو ئەنجام نادرێت، خوای گەورە داوای لێ دەکات کە قەدی دارخورماکە بجوڵێنێت، لەکاتێکدا قەدی دارخورماکە گەورە و بەهێز و دامەزراوە و جوڵاندنی زۆر قورسە، خوای گەورە پێی دەڵێت: ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ﴾ مريم: ٢٥.

واتە: (ئەو دارخورمایەش (کە پاڵت پێوەداوە) کەمێك ڕایوەشێنە).

مەریەم لەم حاڵەتە بێ هێزیەدا نەیئەتوانی ئەو دارە بەهێزە بجوڵێنێت، بەڵام خوای گەورە دەیویست تەنها هۆکارەکە

بەکاربهێنێت بەوەی دەستی بخاتە سەر دارەکە، تاوەکو یاسای هۆکارەکان جێبەجێ ببێت و تاوەکو سوننەتی خوای گەورە لە گۆڕانکاریدا بێتە دی، ئەنجامەکەشی ئاوەها بوو ﴿تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ٢٥﴾ مریم: ٢٥. واتە: (خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێنێت).

ئەمە سوننەتی خوایە لە گۆڕین و گۆڕانکاریدا، بۆیە هەرگیز ناکرێت ئیماندارێك لە یەکێك لە ماڵەکانی خوادا بمێنێتەوە (با ئەو ماڵە مەککەی پیرۆزیش بێت) ئەنجا دابنیشێت و خواپەرستی بکات و داوا لە خوای گەورە بکات رزق و رۆزی بۆ بنێرێت. هەرگیز ناکرێت خوای گەورە دوعاکەی قەبوڵ بکات بەبێ ئەوەی ئەو ئیماندارە هۆکاری دەستکەوتنی رزق و رۆزی بەکار بهێنێت، چونکە ئاسمان زێڕ و زیو نابارێنێت.

خوشکی ئازیز دەی تۆ هۆکارەکانی هیدایەت بەکار بهێنە بە پشتیوانی خوا دەستت دەکەوێت، لەو هۆکارانە دوعا و نزا کردنە بۆ دەسکەوتنی هیدایەت، هەروەها هەڵبژاردنی دۆست و هاوەڵی چاك، رووکردنە قورئان و خوێندنەوەی بە تێگەیشتنەوە، رووکردنە ئەو کۆمەڵ و کەسانەی کە بۆ یادی خوا دادەنیشن و کۆدەبنەوە، گوێگرتن لە وتاری ئایینی و کاسێتی ئایینی و خوێندنەوەی کتێبە ئایینیەکان، پێش ئەمانەش هەمووی وازهێنانە لە هەموو ئەو شتانەی کە دوورت دەخەنەوە لە رێگەی هیدایەت و خواناسین،

وەك: هاوەڵی خراپ، خوێندنەوەی گۆڤاری ئاست نزم، بەدواچوونی ئەو بەرنامە تەلەفزیۆنیانەی کە هانی پەیوەندیە حەرامەکان دەدەن لە فلیم و زنجیرە فلیم و هتد...، گەشتکردن لەگەڵ گەنجی نامەحرەم، پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان لەگەڵ گەنجاندا و شتانی تر لەو کارانەی کە رێگرن لە رێگەی هیدایەت و خواناسیندا.

## گومانی پێنجەم:
## شوونەکردن

هەندێك جلی بالاپۆشی لەبەر ناکەن بە بیانوی ئەوەی دەترسن شویان دەست نەکەوێت. ئەمە گومانێکە شەیتان دەیخاتە دەروونی هەندێك لەو خوشکانەی کە باڵاپۆش نین، ئەمەش لەوێوە سەرهەڵدەدات کە گوایە لاوان نایەنە پێشەوە بۆ داواکردنی کچێك تاوەکو جەستە و قژو جوانیەکەی نەبینن، خۆ ئەگەر ئەو کچە باڵاپۆش بێت ئەوا شتێکی ئەوتۆ لەو کچە نابینن تاوەکو هانی بدات و بێتە پێشەوە بۆ داواکردنی، بەڵکو زۆرێك لە دایك و باوکان ئەو بۆچونەیان هەیە و رێدەگرن لە باڵاپۆشی کچەکانیان لەپێناوی ئەو ئامانجەدا. ئەم گومانەش لە دوو لاوە یان دولایەنەوە وەڵام دەدرێتەوە.

لایەنی یەکەم: لایەنی تیۆری:

ئەویش ئەوەیە کە جوانی هەرچەندە هۆکارێکی سەرەکیە لە شووکردندا، بەڵام تەنها هۆکار نیە بۆ شووکردنی ئافرەت، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ هۆکارە جۆراوجۆرەکانی روونکردۆتەوە کە

ئافرەت لەپێناویدا مارە دەكرێت و فەرمویەتی: (تُنكحُ المرأةُ لأربع : لمالِها و لحسَبها و لجمالِها و لدينِها ، فاظْفَرْ بذاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يداك)[1].

واتە: ئافرەت لەبەر چوار شت داوادەكرێت یان مارە دەكرێت: لەبەر ماڵ و سامانەكەی، لەبەر پایەی كۆمەڵایەتی، لەبەر جوانیەكەی، و لەبەر دینەكەی، تۆ هەوڵبدە دیندارەكەت دەست بكەوێت با توشی خەیر و فەڕ بیت.

خەمی خەڵكی بەو جۆرەیەو ئەوان تەنها سەیری جوانی ناكەن، بەڵكو چەند هۆكارێك هەن لەگەڵ جوانیدا، یان جگە لە جوانی هۆیەكی تر هەیە لە هەڵبژاردنی خێزاندا، بەڵام ئەو خوشكانە یان ئەو دایك و باوكانە وا ئەزانن جوانی هەموو شتێكە، یان جوانی تەنها هۆی سەرەكیە و ئەكرێت هۆكارەكانی تر پشتگوێ بخرێت و وازی لێ بهێنرێت، بەڵام ئەمە پێچەوانەی نەریتی خەڵكییە.

---

(١) بوخاری: (٥٠٩٠)، موسلیم: (١٤٦٦).

لایەنی دووەم: لایەنی واقیعی:

لەوانەیە بێ لەچکی و بێ باڵاپۆشی هۆیەك لە هۆیەکان بێت بۆ ژن نەهێنانی کۆمەڵێك لە لاوەکان و دوورکەوتنەوەیان لەو کۆمەڵە خوشکە بێ لەچکانە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو کوڕە لاوانە گومانیان لە لا دروست دەبێت و دەڵێن ئەم جۆرە کچانە لەبەر ئەوەی گوێ بە فەرمانی خوای گەورە نادەن کە باڵاپۆشییە کەوابوو دوور نیە گوێ بە شتی تریش نەدەن، چونکە شەیتان کارەکانی هەنگاو لەدوای هەنگاو ئەنجام دەدات، هەرچەندە واقیع هەندێك جار بەم جۆرە بۆچوونە رازی نیە، بەڵام ئەمە حاڵەتی زۆربەی لاوەکانی ئەمڕۆمانە، ئەوان سورن لەسەر داواکردنی ئەو کچانەی کە پابەندن بە باڵاپۆشییەوە و ناو وناوبانگیان باشە ئەگەر چی لاوەکە خۆی لە کەسە گەرموگوڕ و پابەندەکان نەبێت بە دینەوە.

## گومانی شەشەم:

## منداڵێتی

ئەم گومانەش زۆرتر دایکان و باوکان دەیڵێنەوە، لەگەڵ هەندێك لەو خوشکانەی کە بێ لەچکن، تویژێك خوشك هەن زۆرجار نیازی بالاپۆشییان هەیە، بەڵام بەهۆی ئەم گومانەوە کاتەکەی دوا دەخەن، ئەم رایەش زیاتر لە حەز و ئارەزووەوە نزیکترە تاوەکو گومان، ئەوان زۆرجار بەم جۆرە وەڵامت دەدەنەوە: (گوناهە لە چێژوەرگرتن لەم ژیانە خۆشە بێ بەشیان بکەین، کچەکەم هێشتا منداڵە و حەزی لە جل و بەرگی جوانە، زۆر حەزی لە جلی جوانە و زۆر ئارەزووی جۆرەکانی قژبەستن دەکات، کاتێك جوانی خۆی دەردەخات زۆر ئاسودە دەبێت و زیاتر چێژ لە ژیان وەردەگرێت، دەی کەوایە بۆ رێگری لێ بکەین و بەم منداڵیە رێگەی ئاسودەیی لێ ببەستین، خۆ ئەگەر ئێمە شەمەندەنەفەرەکە بەجێی هێشتوین، بۆ بیەڵێن بەم خێراییە ئەویش بەجێ بهێڵێت).

منداڵی بەلای دایك و باوکانەوە تاوەکو بیستساڵی درێژە دەکێشێت، و ئەو کچە لە تەمەنی سیانزە ساڵیەوە دەکەوێتە بێ نوێژییەوە، کەچی لەبۆچوونی ئەواندا هێشتا منداڵە.

**وتەیەك بۆ دایك و باوكان:**

ئەو دایك و باوكانەی ڕێگرن لە بالآپۆشی كچەكانیاندا بە بیانووی منداڵێتیەوە، لەڕاستیدا لێپرسراویەتێكی گەورەیان لە ئەستۆدایە بەرامبەر خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا.

كچ كە دەگاتە كات و تەمەنی بێ نوێژی بەپێی شەریعەت بالآپۆشی لەسەر واجب دەبێت، و ئەو دایك و باوكەی كە ڕێگەی بالآپۆشی لێ دەگرن توشی گوناهێكی گەورە دەبن، و خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ دەكات: ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾﴾ الصافات: ٢٤.

واتە: (لەكاتی ڕاپێچ كردنیاندا فەرمان دەدرێت: ئادەی بیانوەستێنن، بێگومان ئەوان بەرپرسیارن).

هەروەها پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت: (كلُّكم راعٍ ، و كلُّكم مسؤولٌ عن رعيَّتِه)[1].

كەوابوو باوك شوانی یەكەمە لەناو ماڵ و خێزاندا و ئەویش لێپرسراوی یەكەمە لە ڕۆژی قیامەتدا بەرامبەر هەر تاكێكی ئەو خێزانە، دەبا ئەو باوكە لەخۆی بپرسێت ئایا كچەكەی چەند كوڕی لاو توشی فیتنە دەكات و ئەبێتە هۆی لەڕێگە دەرچوونیان؟

(١) بوخاری (١٣/١٠٠).

کچەکەش خۆی توشی چەند رەفتاری خراپ دەبێتەوە لە لایەن ئەو کوڕانەوە؟.

## وتەیەکی خۆشەویستی بۆ ئەو خوشکە بچوکەمان:

خوای گەورە شایەتە کە ئێمە لە سزای خوایی دەترسین بەرامبەر بە تۆ، و ئێمە سورین لەسەر رزگارکردنت لە هەموو ئەو مەترسیانەی کە رووبەڕووی تۆ دەبنەوە لە دونیا و قیامەتدا، چونکە ئەمە ئەرك و واجبی موسڵمانە بەرامبەر برا و خوشکی موسڵمانی خۆی.

لەو مەترسیانەی کە توشی خوشکی بێ لەچك دەبێتەوە لە دونیا و لە قیامەتدا ئەوانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوون، ( سيكونُ في آخرِ أمَّتي رجالٌ يركَبونَ على سُروجٍ كأشباهِ الرِّحالِ ينزلونَ على أبوابِ المساجدِ نساؤُهم كاسياتٌ عارياتٌ على رؤوسِهنَّ كأسنمةِ البُخْتِ العِجافِ، الْعَنُوهُنَّ فإنَّهنَّ ملعوناتٌ)[1].

خوشکی ئازیزی بێ لەچك و دوور لە باڵاپۆشی ئەزانیت مانای (اللعنە) چییە؟ (اللعنە) واتە: دەرچوون لە رەحمەتی خوا. و لەوفەرمودەیەی باسکرا پێغەمبەر ﷺ فەرمان بە هەموو موسڵمانێك دەکات کە ئەو توێژە لە ئافرەتان بەر لەعنەت بدەن، ئەوانیش کۆمەڵێك ئافرەتن کە جلیان لەبەر کردووە بەڵام شوێنی

---

(١) موسنەدی ئیمام ئەحمەد (٣٦/١٢) و سەحیحی ئیبنو حیببان: (٥٧٥٣).

فیتنه و عەورەتیان دانەپۆشییوە، وەك ئەوە وایە هیچیان لەبەردا نەبێت.

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (صِنْفانِ مِن أهْلِ النَّارِ لَمْ أرَهُما، قَوْمٌ معهُمْ سِياطٌ كَأذْنابِ البَقَرِ يَضْرِبُونَ بها النَّاسَ، ونساءٌ كاسِياتٌ عارِياتٌ مُمِيلاتٌ مائِلاتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأسْنِمَةِ البُخْتِ المائِلَةِ، لا يَدْخُلْنَ الجَنَّةَ، ولا يَجِدْنَ رِيحَها، وإنَّ رِيحَها لَيُوجَدُ مِن مَسِيرَةِ كَذا وكَذا)[1].

لەم فەرمودەیەدا وەسفێکی وردی ئەم توێژەی ئافرەتان کراوە، ئەویش:

١- داپۆشراوە بە هەندێك جلوبەرگ بەڵام نیوە روتێکە چونکە زۆربەی جەستەی بەدەرەوەیە و ئەو شوێنانەی جەستەی بەدەرەوەیە کە ئارەزووی پیاو دەوروژێنێت، وەك ران و شان و سنگ، وە ئەو شوێنانەی کە داپۆشیوە تەواو نیە داپۆشینەکە شەرعی نیە چونکە جەستەی دەرکەوتووە ئەویش لەبەر تەسکی یان تەنکی جلەکە و وەك ئەوە وایە رووت بێت هەرچەندە داپۆشراوە.

٢- لە رێکردندا لار و لەنجە دەکەن و بەوەش دڵی کوڕان رادەکێشن و ئارەزویان دەجولێنن.

---

(١) موسلیم: (٢١٢٨).

٣ـ لە قژداهێنان و تەسریحەی قژەکانیاندا و دانانی بارۆکە لەسەر سەریاندا بەجۆرێکە کە لە بەرزایی سەر پشتی وشتر دەچێت.

لە فەرمودەکەدا ئەو راستییە روون دەکاتەوە کە ئەم توێژەی ئافرەتان بێبەشن لە بەهەشت، بەڵکو لە بۆنی بەهەشتیش بێ بەشن، هەرچەندە رەحمەت و بەزەیی خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دەگرێتەوە، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمان بە موسڵمانان دەکات کە دوعا لەو توێژە بکەن بۆ دەرکردنیان لە رەحمەتی خوا (العنوهن فانهن ملعونات).

خوشکی ئازیز ئێمە تەنها خێر و چاکەمان بۆتۆ دەوێت، دەترسین توشی سزا و ئازاری دونیا و قیامەت بیت، بۆیە لە قوڵایی دڵەکانمانەوە ئاواتەخوازین کە لە هەموو خراپەیەك بەدوور بیت و دڵەکەت پڕ بێت لەو نوورە خواییەی کە کوژانەوەی نیە، خوای گەورە بەسەر شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکەدا زاڵت بکات، ئاواتەخوازین بڕیار بدەیت و ئەو کەلەپچەیە بشکێنیت و ئازاد بیت لە دیلی حەز و ئارەزووە خراپەکان و بگەیتە جیهانی ئازادی و سەربەرزی و رێز و حەوانەوەی دەروونی و پاکی و داوێن پاکی.

## ئایا گەرەنتی تەمەنی خۆت دەکەیت؟

خوشکی بێ لەچك:

کاتێك بالاپۆش نابیت بە بیانووی مندالّی تەمەنەوە، ئایا گەرەنتی تەمەنی خۆت بۆ چەند ساتێکی کەم دەکەیت؟ ئایا کاتی مردنی خۆت دەزانیت، یان کەسێك هەوالّی ئەو کاتەی پێ داویت؟ خۆ ئەگەر وەلامەکەت نەخێر بوو، دەی کەوایە لەوانەیە دوای یەك سالّی تر تۆ بمریت، یان لەوانەیە یەك مانگی تر، یان هەفتەیەکی تر، یان رۆژێکی تر، یان سەعاتێکی تر، یان خولەکێکی تر.. ئەوانە هەمووی گریمانەن چونکە ئێمە کاتی مەرگی خۆمان نازانین، خوشکی ئازیزم مردن تەنها لە دەرگای کەسە بەتەمەن و نەخۆشەکان نادات و بەس، بەلّکو سەردانی لەش ساغ و پیر و لاو دەکات، تەنانەت سەردانی مندالّی شیرەخۆرەش دەکات، و نمونەش لە واقیعی حالّماندا زۆرە.

# چەند چیرۆکێکی واقیعی

**چیرۆکی یەکەم: توشبوونی لەناکاو**

پیاوێك کە ئەندامی ئەنجومەنی گەلە (لە وڵاتێکدا) لە تەواوی تەندروستی و چالاکێتیدا لە لوتکەی لاوێتیدا دەبێت، لەناکاو توشی جۆرە ڤایرۆسێك دەبێت لە مێشکیدا، لە چەند ساتێکی کەمدا ئەم پیاوە بۆ تۆپەڵە گۆشتێك دەگۆڕێت و ئاگای لەخۆی نامێنێت و دەمرێت.

**چیرۆکی دووەم: مردن نەخۆش و لەش ساغ ناناسێت:**

ئەفسەرێکی گەورە لە سوپادا (خاوەنی جەستەیەکی پتەو بووە و هاواری لە هیچ نەخۆشییەك نەکردوە)، خاوەنی ماسولکەی بەرز و بەهێز بوە، لە ناوچەکەی خۆشیدا کەسێکی چالاك بوە، شەوێکیان دەنوێت، سەرلەبەیانی دایکی دەیەوێت خەبەری بکاتەوە، سەیر ئەکات هەموو جەستەی وشك بووە و وەڵام ناداتەوە، تومەز مردن لەکاتی نوستندا بۆتە میوانی.

چیرۆکی سێیەم: هاوەڵەکەم سوتا:

باوکی عەبدوڵڵا دەڵێت: نازانم چۆن ئەم چیرۆکەت بۆ بگێڕمەوە کە ماوەیەك پێش ئێستا خۆم یەکێك بووم لە کەسەکانی ناو چیرۆکەکە و بوو بەهۆی گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانم، لەڕاستیدا بڕیارم دابوو کە باسی نەکەم، بەڵام دواتر هەستم بە لێپرسراوێتی بەرامبەر خوای گەورە کرد و هەروەها بۆ ئاگادار کردنەوەی هەندێك لەو کوڕە لاوانەی لەخوا یاخی دەبن و هەندێك لەو کچانەی بەدوای گومانێکی قەڵبدا رادەکەن و .. ناوی خۆشەویستیە! ئێمە سێ هاورێ بوین گەمە و گاڵتە و سەرەڕۆیی و هەڵەشەیی کۆی کردبووینەوە... نەخێر.. چوار بووین، چونکە شەیتان چوارەممان بوو.. بۆ راوکردنی کچانی گێل و سادە لەماڵ دەردەچوین، بەقسەی شیرین دە مانخەڵەتاندن و وردە وردە دەمان بردن بۆ باخ و باخاتە دوورەکان.. لەوێدا توشی شۆك دەبوون کاتێك دەیانبینی ئێمە وەك گورگ پەلاماریان دەدەین و بەزەییمان بە پاڕانەوەکانیاندا نایەتەوە، لەڕاستیدا دڵ و هەست و سۆزمان مردبوو.

شەوان و رۆژانمان بەمجۆرە بەسەر دەبرد لەناو باخ و خێوەتگا و ئۆتۆمبێلەکانی لێوار دەریادا.. تاوەکو ئەو رۆژە هاتە پێش کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە...وەك جاران بۆ باخە دوورەکان بەرێ کەوتین و گەیشتینە شوێنەکە... هەموو شت ئامادە بوو...نێچیر بۆ هەریەکەمان، شەرابی نەفرین لێ کراو، تەنها شتێکمان بیر چووبوو

ئەویش خواردن بوو، دوای کەمێك یەکێکمان بۆ کڕینی ژەمی شێوان بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بەرەو شار بەڕێکەوت.

سەعات نزیکەی شەشی ئێوارە بوو، چەند کاتژمێرێك تێپەڕی و ئەو هەر نەهاتەوە... کاتێك سەعات گەیشتە (١٠)ی شەو توشی دڵەڕاوکە بووم بۆ هاوەڵەکەم، بۆیە بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم بەڕێ کەوتم بۆ ئەوەی بەدوایدا بگەڕێم و هەواڵی بزانم، لەڕێگە هەندێك بڵێسە ئاگرم چاو پێ کەوت کە لە هەردوو دیوی جادەکەوە بوو " هێشتا نەکوژابویەوە، کە گەیشتمە نزیکی ئاگرەکە توشی شۆك بووم کاتێك زانیم کە ئەمە ئۆتۆمبێلی هاوڕێکەمە و وەرگەڕاوە و کەوتووە بەلایەکدا و گڕی تێ بەربووە، وەك شێت هەڵمەتم برد و ویستم لە ئۆتۆمبێلە پڕ لە ئاگرەکە دەری بهێنم.. واقم وڕما کاتێك بینیم نیوەی لاشەی سوتاوە!... بەڵام هێشتا لە ژیاندا بوو.. خێرا گواستمەوە بۆ سەر زەویەکە و دوای دەقیقەیەك چاوەکانی کردەوە و بەدەم وڕێنەوە دەیوت: ئاگر... ئاگر..

بڕیارمدا خێرا هەڵی بگرم و بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم بەرەو نەخۆشخانەی بەرم... بەڵام بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە پێی وتم: سودی نیە... تازە ناگەمە نەخۆشخانە..

فرمێسك بە چاوەکانمدا هاتنە خوارەوە، ئەوەتا هاوڕێکەم بە بەرچاومەوە دەمرێت...

لە هاوارکردنەکەی واقم وڕما کە دەیوت: چی بڵێم؟! چی بڵێم؟!

بەسەرسامیەوە تەماشام کردو لێم پرسی: چی بە کێ بڵێیت؟!.

وەك لە چاڵێکی قوڵەوە وەڵامم بداتەوە وتی: الله.

هەستم بە ترسێك کرد کە جەستە و هەست و هۆشمی داگیر کردبوو.. لە پڕێکدا هاوڕێکەم هاوارێکی گەورەی لێ بەرز بویەوە.. ئینجا دواهەناسەی دا و تەواو بوو..

ڕۆژگار تێپەڕین، بەڵام دیمەنی هاوڕێ کۆچکردووەکەم کە هاواری دەکرد و ئاگرەکە دەیخوارد و ئەویش دەیوت: چی بڵێم؟.. چی بڵێم؟.. هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە...

ئینجا لەپڕ لە خۆمم پرسی: ئەی من؟ من چی بڵێم؟!... چاوەکانم پڕ لە فرمێسك بوون و لەرزێکی نامۆ دایگرتم، لەهەمان کاتدا گوێم لە بانگدەری بانگی بەیانی بوو کە بانگی دەکرد: الله أكبر.. الله أكبر... أشهد ان لا اله الا الله... أشهد ان محمداً رسول الله.. حي علی الصلاه.. هەستم کرد کە ئەو بانگە تایبەتە بە من، بانگم دەکات تاوەکو پەردەیەك دادەمەوە بەسەر سەردەمی تاریکی ژیانمدا... بانگم دەکات بۆ ڕێگای نور و هیدایەت.. بۆیە خۆمم شت و ئینجا دەستنوێژم هەڵگرت و جەستەم لەو پیسییانە پاککردەوە کە ساڵەهایدا تیایدا نوقم بووبووم.. نوێژەکەم ئەنجام دا ولەو ڕۆژەوە یەك فەرزم لە دەست نەچووە، سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە شایستەی سوپاسە، ئێستا من مرۆڤێکی ترم و پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە حاڵەتەکان دەگۆڕێت، بە یارمەتی خوای گەورە

لە ئامادەباشیدام بۆ عەمرە.. پشت بەخوا حەجیش دەکەم..
ئەمەنیش بەدەست خوایە".

**چیرۆکی چوارەم: دوو کۆتایی دژ بەیەك:**

"قۆناغی یەکەمی خوێندنم لەگەڵ دایك و باوکمدا و لە ژینگەیەکی چاك و پاکدا بەسەر برد... لە کاتی گەڕانەوەمدا لە نیوەشەوێکی درەنگدا گوێم لە نزا و دوعایەکانی دایکم دەبو، لەکاتی نوێژە درەنگ کاتەکانیشدا گوێم لە دەنگی باوکیشم دەبوو، سەرم سوڕدەما لە درێژی نوێژەکانی، بەتایبەتی لە کاتی زستاندا کە خەوتن گەلێك خۆشتر و شیرینترە ، سەرم سوڕدەما و دەمگوت: باوکم چەند خۆڕاگر و بەسەبرە، هەموو ڕۆژێك ئاوەهایە، شتێکی سەیرە، نەمئەزانی کە ئەم نوێژە حەوانەوەی ئیمانداره و نوێژی پیاوچاکانە، لە جێگەکەیانەوە رادەپەڕن بەمەبەستی دوعا و موناجاتی خوای گەورە.

دوای تەواو کردنی قۆناغی خوێندنی سەربازیم، هەستم کرد کە گەورە بووم و دووریم لە خواوە زیاتر و گەورەتر بووە، هەرچەندە ناوبەناو گوێم لە کۆمەڵێك ئامۆژگاری دەبوو.

دوای تەواوکردنی خوێندن لە شارێکی تری دوور لە شارەکەی خۆم دامەزرام، ئازاری غەریبی لەسەر دەروونم کەم بویەوە کاتێك هاوەڵەکانی خۆمم لە کارەکەدا ناسیەوە..

دەنگی قورئان لەگوێکانم دابڕابوو، دەنگی دایکم لە گوێکانم دابڕابوو، ئەو دەنگەی کە بۆ نوێژی بەیانیان هەڵی ئەساندم و هانی ئەدام لەسەری... ئێستا بەتەنها ئەژیم، دوور لەو کەشە خێزانییەی کە پێشتر تیایدا بووم، لە کارەکەمدا بۆ چاودێری کردنی ڕێگەوبانە

هێزاکان و دەورووپشتی شار ئاراستە کرام، بۆ پارێزگاری لە ئاسایش و چاودێری رێگا و یارمەتیدانی لێقەوماوان... کارەکەم رۆژانە تازە دەبویەوە و بەئارامی دەژیام، بەوپەڕی گرنگی و دڵسۆزیەوە کارەکەی خۆمم ئەنجام دەدا، بەڵام لە قۆناغێکدا دەژیام کە شەپۆلەکان لە یەکیان دەدا و بەرزونزمیان دەکرد، لەبەر زۆری کات و کەمی دۆست و ناسراو تێ رادەمام و نەمئەزانی چی بکەم، وردە وردە هەستم بە بێزاری دەکرد، کەس نەبوو بۆ دینەکەم هاوکاری و یارمەتیم بدات، بەڵکو پێچەوانەکەی راست بوو، لە دیمەنە دووبارە بووەکانی رۆژانەی ژیانم رووداوی ئۆتۆمبێل و برینداره‌کان بوون، بەڵام ئەو رۆژە رۆژێکی جودا بوو، من و هاوەڵەکەم لەلایەکی رێگاکەوە وەستابوین و قسەمان بۆ یەکتر دەکرد، لەپڕێکدا گوێمان لە دەنگی پێکدادانێکی گەورە بوو، ئۆتۆمبێلێکمان بینی رووبەڕوو لەوی تری داوە، خێرا بۆ جێگەی کارەساتەکە رامانکرد " بۆ رزگارکردنی برینداره‌کان.

رووداوێك بوو باس ناکرێت.. دوو کەس لە ئۆتۆمبێلەکەدا بوون و لە حاڵەتێکی خراپدا بوون، لە ئۆتۆمبێلەکە دەرمان هێنان و لەسەر زەوییەکە پاڵمان خستن، رامانکرد بۆ دەرهێنانی خاوەنی ئۆتۆمبێلی دووەم، بەڵام ئەوکۆچی دوایی کردبوو، گەڕاینەوە بۆ لای دوانەکەی یەکەمجار ، ئەوانیش لە گیانەڵڵادا بوون، هاوەڵەکەم ویستی شایەتومان بخاتە سەر زوبانیان، بڵێن: لا اله الا الله.. لا اله الا الله... بەڵام دەنگی گۆرانی یان لێ بەرز بویەوە، هەڵوێستەکە

ترساندمی، هاوەڵەکەم بە پێچەوانەوە حاڵەتی مردووانی دەزانی، شایەتومانی بۆیان دووبارە دەکردەوە...

بە بێدەنگی وەستابووم و هیچم نەدەکرد و چاوەکانم زەق زەق دەیانڕوانی، لە ژیانمدا هەڵوێستێکی لەم جۆرەم نەبینیبوو، بەڵکو بڵێ پێشتر حاڵەتی مردنم نەبینیبوو و بەم شێوازەش، هاوڕێکەم هەر شایەتومانی دووبارە دەکردەوە و ئەوانیش هەر بەردەوام بوون لە گۆرانی وتن... سودی نیە، دەنگی گۆرانییەکە وردوردە کەم دەبویەوەو، یەکەمیان بێدەنگ بوو.. دووەمیشیان هەر دوابەدوای ئەو پێدەنگ بوو، جوڵە نەما.. دونیایان بەجێهێشت.

بۆناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆمان هەڵمانگرتن، هاوەڵەکەم ورتەی لێوە نەدەهات، ماوەیەك بەبێدەنگی ڕۆیشتین و پاشان هاوەڵەکەم باسی مردن و ئاخر شەڕی بۆدەکردم، کە مرۆڤ کۆتایی ژیانی یان خێر دەبێت یان شەڕ، و ئەم کۆتایی و دواساتەی ژیانی مرۆڤ بەڵگەن لەسەر ئەو کارانەی کە زۆرجار لە ژیانیدا ئەنجامی داون... ئینجا چیرۆکێکی زۆری بۆ گێڕامەوە کە لە کتێبە ئیسلامیەکاندا باس کرابوون، و چۆن هەموو کەسێك کۆتایی ژیانی بەوجۆرە دەبێت کە لە دەرەوە و ناوەوەیدا ڕەنگی داوەتەوە، بە باسکردنی مردن و مردوان ڕێگەکەمان کۆتایی پێ هێنا، دیمەنەکە تەواوتر دەبوو کاتێك بیرم دەکەوتەوە کە ئێمە مردوومان پێیە و مردوومان هەڵگرتووە... لە ڕووداوەکە وانەیەکم وەرگرت و لە مردن ترسام.

ئەو ڕۆژە نوێژێکی پڕلەخشوع و ملکەچیم ئەنجامدا، بەڵام ئەو هەڵوێست و ڕووداوەم وردە وردە لەبیر چویەوە و دیسانەوە بۆ ڕەفتار و خوی جارانم گەڕامەوە... هەروەك ئەو دوو پیاوەم نەبینیبێت کە کارەساتەکەیان بەسەر هاتبوو، بەڵام لەڕاستیدا گۆڕانیم لەبەرچاو کەوت و وەك جاران حەزم لێ نەدەکرد، ئەوەش لەوە ئەچێت بەهۆی گوێگرتنم بێت لە گۆڕانی دو پیاوەکە لە سەرەمەرگدا... لەسەیرو سەمەرەکانی ژیان..

دوای ماوەیەك" زیاتر لە شەش مانگ، ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر ڕوویدا، کەسێك زۆر ئاسایی ئۆتۆمبێلەکەی خۆی لێی دەخوری ، لە یەکێك لەو نەفەقانەی کەبەرەو شار دێت ئۆتۆمبێلەکەی پەکی دەکەوێت، ئەویش لە ئۆتۆمبێلەکەی دادەبەزێت و دەبینێت پەنچەرە، کە سندوقەکەی دەکاتەوە بۆ داگرتنی تایە سپێرەکەی، ئۆتۆمبێلێکی خێرا دێت و لەدواوە لێی دەدات و بەخەستی بریندراری دەکات... من و هاوڕێیەکەم (نەك هاوڕێی پێشوم) ئامادەبوین و بۆناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆمان هەڵمانگرت و پەیوەندیمان بە نەخۆشخانەوە کرد بۆ پێشوازی کردنی، لاوێك لە چڵەپۆی لاوێتیدابوو، شێوازی لەوە ئەچوو کە کەسێکی پابەند بێت بە دینەوە، کەبۆناو ئۆتۆمبێلەکە هەڵمانگرت گوێمان لە ورتەیەك بوو، بەڵام لەبەر پەلەکردن نەمانزانی چی ئەڵێت، دوای ئەوە هەڵمانگرت و بەڕێ کەوتین، گوێمان لە دەنگێکی زۆر جیاواز بوو.. لاوەکە قورئان ئەخوێنێت، بە دەنگێکی تەڕی خۆش... سبحان الله

نەتئەوت ئەم لاوە بریندارە، خوێن هەموو جلەکانی داپۆشیبوو، ئێسکەکانی هەموو شکابوون، بەڵکو وادیاربوو کە لە لێواری مەرگدایە، بەدەنگێکی خۆش قورئانی ئەخوێند و بەردەوام بوو بەشێوازی تەرتیل، لەژیانمدا قورئان خوێندنی لەو شێوەیەم نەبیستبوو، لەگەڵ خۆمدا وتم ئێستا شایەتومانی پێ دەڵێم هەروەك چۆن هاوەڵەکەی یەکەم جارم ئەنجامیدا لەگەڵ دوو پیاوەکەدا، چونکە ئێستا لەو رووەوە شارەزاییم هەیە، لەبەر دەنگە خۆشەکە من و هاوەڵەکەم بێدەنگ بووین، هەستمکرد موچرکەیەك بەلەشمدا و لەنێو پەراسوەکانمدا گوزەر دەکات... لەپڕێکدا دەنگەکە نەما، بۆدواوە ئاوڕم دایەوە، تەماشادەکەم پەنجەی شایەتومانی بەرز کردۆتەوە و شایەتومان ئەڵێت، ئینجا سەری دانەواند، بازمدایە دواوە، دەستم لە دەستی دا، لە دڵی، لە هەناسەی، هیچ نیە، ماڵئاوایی لە ژیان کردوە... بەقوڵی تەماشایەکم کرد، فرمێسك بەچاوانمدا هاتە خوار و لە هاوەڵەکەمم شاردەوە، ئینجا ئاوڕم بەلای ئەودا دایەوە و پێم وت: پیاوەکە مرد... هاوەڵەکەم دایە پڕمەی گریان، بەڵام من هاوارم لێ بەرز بویەوە و گریان و فرمێسکم نەدەوەستان، دیمەنی ئێمە لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا کاریگەربوو، گەیشتینە نەخۆشخانە... هەرکەسێکمان پێ دەگەیشت چیرۆکی ئەو پیاوەمان بۆ دەگێڕایەوە، زۆرکەس رووداوەکە کاری تێ دەکرد و دەگریا، یەکێك لەو کەسانە دوای بیستنی چیرۆکی ئەو پیاوە رۆیشت و نێوچاوانی ماچ کرد، هەموو سور بون لەسەر ئەوەی کە

نەڕۆن تاوەکو نەزانن کەی نوێژی لەسەر دەکرێت تاوەکو ئەوانیش بەشدار بن.

یەکێك لە کارمەندانی نەخۆشخانەکە بەتەلەفۆن پەیوەندی بە ماڵی مردووەکەوە کرد، قسەکەرەکە برای بوو، ئەو وتی: براکەم هەموو دووشەممانێك بۆ سەردانی داپیرەی بۆ لادێ دەچوو، بەردەوام سەری لە بێوەژن و هەتیوو و هەژاران دەدا، خەڵکی لادێکە هەموویان دەیانناسی چونکە کتێب و کاسێتی ئایینی بۆ دەبردن، و هەرکاتێك دەڕۆیشت ئۆتۆمبێلەکەی پڕ دەکرد لە برنج و شەکر بۆئەوەی بەسەر هەژار و نەداراندا دابەشی بکات، تەنانەت شیرینی منداڵەکانیشی لەبیر نەدەکرد تاوەکو ئەوانیش دڵخۆش بکات، و هەرکەسێك پێی بوتایە: ماندودەبیت و گەشتەکەت دوور و درێژە. لەوەڵامدا دەیوت: من سود لە دووری رێگاکە وەردەگرم بۆ موراجەعە و خوێندن و لەبەرکردنی قورئان، هەروەها گوێگرتن لە کاسێت و وتاری ئایینی، وە من بۆ هەموو هەنگاوەکانم بەتەمای پاداشتی خوای گەورەم.

کە سبەینێ هات، مزگەوتەکە پڕبوو لە نوێژ خوێنان، منیش لەگەڵ ئەو هەموو موسڵمانە زۆرەدا نوێژم لەسەر کرد، دوای تەواوبوونی نوێژی جەنازە تەرمەکە بەرەو گۆڕستان بەڕێ خرا، خرایە نێو

چاڵێکی تەسکەوە، وتیان: رووی لە قیبلە بکەن، بەناوی خودا و لەگەڵ ئوممەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)، ئینجا خۆڵمان کرد بەسەریدا، دوعای دامەزراوی بۆ براکەتان بکەن، چونکە پرسیاری لێ دەکرێت، پێشوازی لە یەکەم رۆژی ئاخیرەت کرد، منیش وەك ئەوەی پێشوازی لە یەکەم رۆژی دونیا بکەم ئاوەهابوو، تەوبەم لە کردەوەکانی پێشووم کرد، بەڵکو خوا لە کردەوەکانی رابردووم ببورێت و لەسەر خواپەرستی دامەزراوم بکات و دوارۆژ و ئاخیرەتم خێر بێت، وە گۆڕی من و هەموو موسڵمانان بکات بە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت".

چیرۆکی پێنجەم: گەشتێکی دوور:

خوشکەکەم تادەهات رەنگی زەرد و لاواز دەبوو، بەڵام وەك نەریتی خۆی بەردەوام قورئانی پیرۆزی دەخوێند، کەبۆی دەگەڕای لە شوێنەکەی خۆی و لەسەر بەرماڵەکە دەتدۆزیەوە، لە چەمانەوە یان کڕنوش یان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزدەکردەوە، بەمجۆرە بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە و نیوەشەو بەردەوام دەبوو و بێزار نەدەبوو.

منیش پەیوەست بووم بە خوێندنی گۆڤارە هونەریەکان و ئەو کتێبانەی کە لەشێوازی چیرۆکدا بوون، زۆریش تەماشای ڤیدیۆم دەکرد و ڤیدیۆ ببوو بە هاوڕێیەکی هەمیشەییم و تەواو پێوەی ئالودە بوبووم،لە ئەرکە ئایینیەکاندا سارد بووم و بەتەواوی ئەنجامم نەدەدا و نوێژەکانم لەکاتی خۆیدا نەدەکرد.

دوای داخستنی ئامێری ڤیدیۆکەم و پاش بینینی چەن فلیمێکی جۆراوجۆر بۆ ماوەی سێ کاتژمێری بەردەوام، لەمزگەوتەکەی تەنیشتمانەوە گوێم لە بانگێك بوو، بۆ جێگەی خەوتنەکەم گەڕامەوە، لەسەر بەرماڵەکەیەوە بانگی لێ کردم.

بەڵێ نورە چیت دەوێت؟

بەدەنگێکی روون و جوان پێی وتم: پێش ئەنجامدانی نوێژی بەیانی مەخەوە.

وتم: ئای.. جارێك یەك سەعات نوێژی بەیانی ماوە مەگەر گوێت لێ نەبوو ئەوە بانگی بەیانی بوو؟

بە دەنگە پڕ لە سۆزەکەی (ئەو بەردەوام بەوجۆرە بوو، تەنانەت پێش توشبونیشی بەو نەخۆشییە خراپەو کەوتنی لە جێگادا) بانگی کردم: هەنا، وەرە تەنیشتمەوە.

هەرگیز نەمئەتوانی داواکاریەکانی پشتگوێ بخەم، هەستم بە پاکی و بێگەردی ئەو دەکرد، بێگومان بەدەم داواکەیەوە دەچم، پێم وت: چیت ئەوێت؟

وتی: دانیشە.

وتم: ئەوەتا دانیشتم، چیت هەیە؟

بە دەنگێکی کزی خۆش وتی: ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ﴾ آل عمران: ١٨٥.

واتە: (هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بەتەواوی پێ دەدرێت (دەرئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە ڕێتان)).

تۆزێك بێدەنگ بوو، ئینجا لێی پرسیم: ئایا ئیمانت بە مردن هەیە؟ ئایا ئیمانت بەوە نیە کە لەسەر هەموو شتێکی گەورە و بچووك لێپرسرینەوەت لەگەڵ دەکرێت؟

وتم: بەڵێ، بەڵام خوای گەورە لێبوردە و بەبەزەییە، تەمەنیش جارێك زۆری ماوە.

وتی: ئەی خوشکی خۆشەویستم، ئەی لە مردن و هاتنی مردنی لەناکاو ناترسیت؟ تۆ تەماشا بکە (هیند) لەتۆ منداڵتر بوو کەچی

لەکارەساتی ئۆتۆمبێلدا کۆچی دوایی کرد.. و فلانە ئافرەت و فیسارە ئافرەت... مردن تەمەن ناناسێت، تەمەنیش پێوەر نیە بۆ مردن.

بەترسێکەوە وەڵامم دایەوە (چونکە ئەو شوێنەی نوێژی تیادەکرد تاریك بوو): دەی من لە تاریکی دەترسم و ئێستاش تۆ بەمردن دەمترسێنیت، ئێستا چۆن بنووم؟ وامزانی کە رازی بویت لەم پشووەدا گەشتمان لەگەڵدا بکەیت.

لەپڕێکدا گریان قورگی داگیرکرد و دڵی داچڵەکاندم و وتی: لەوانەیە ئەمساڵ گەشت بکەم، گەشتێکی دوور، بۆ جێگایەکی تر، لەوانەیە هەنا گیان، تەمەن لە دەستی خوای گەورەدایە... دایە پڕمەی گریان.

بیری لە نەخۆشیە خراپەکەی خۆی دەکردەوە، پزیشکەکانیش بەنهێنی هەواڵیان بە باوکم دابوو کە لەوانەیە ئەم نەخۆشییە نەهێڵێت نورە زۆر بژی... بەڵام کێ ئەم هەواڵەی پێ داوە؟ یان خۆی چاوەڕوانی ئەو شتە دەکات.. پێم وت: چیە وا بیر دەکەیتەوە؟

ئەمجارە بەدەنگێکی گەورە وتی: تۆ وائەزانیت من لەبەر ئەوەی نەخۆشم ئەم قسانەت پێ ئەڵێم؟ نەخێر، لەوانەیە تەمەنی من لە تەمەنی زۆرکەسی تەندروست درێژتر بێت، ئەی تۆ تا کەی دەژیت؟

لەوانەیە بیست ساڵی تر بژیت، لەوانەشە چل ساڵ، ئەی دوای ئەوە چی؟

لە تاریکاییەکەدا دەستی دەدرەوشایەوە، ئینجا بە توندی دەستی جوڵاند وو تی: هیچ جیاوازیەك لە نێوان من و تۆدا نیە، هەموومان کۆچ دەکەین و ئێرە بەجێدە هێڵین یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر، گوێت لە فەرمودەی خوای گەورە نەبووە کە دەفەرموێت: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ١٨٥﴾ آل عمران: ١٨٥.

وتم: شەوێکی شاد.. خێرا ڕۆیشتم و گوێم بە دەنگی ئەو دەزرنگایەوە "خوا هیدایەتت بدات.. نوێژەکەت لەبیر نەچێت"..

کاتژمێر هەشتی بەیانییە، گوێم لە دەنگی لێدانی دەرگایە، ئێستا کاتی لەخەو هەستانم نیە، گریان... دەنگەدەنگ... خوایە چی روویداوە؟!... حاڵەتی تەندروستی نورە خراپ بووە و باوکم بۆ نەخۆشخانەی بردووە، ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ (ئێمە هی خوای گەورەین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە)، ئەمساڵ گەشت نیە، لەچارەم نوسراوە ئەمساڵ لەماڵی خۆماندا بمێنمەوە، دوای چاوەڕوانیەکی زۆر، لە سەعات یەکی نیوەڕۆدا باوکم لە نەخۆشخانەوە تەلەفونی بۆ کردین و وتی: ئەتوانن ئێستا سەردانی بکەن، خێرا وەرن.

دایکم هەواڵی پێدام کە قسەکانی باوکم دڵنیایی تێدا نیە و دەنگیشی گۆڕاوە... عەباکەم بەدەستەوە بوو، کوا شۆفێرەکە؟..

خێرا سەرکەوتین، کوا ئەو ڕێگایەی لەگەڵ شۆفێرەکەدا هەندێکجار بۆ پیاسە گوزەرم پێدا دەکرد؟ دیارە ڕێگاکە کورتە... ڕۆژێکی درێژە... یەکجار درێژە... کوا ئەو قەرەباڵغیەی حەزم پێ دەکرد و بە راست و چەپی خۆمدا دەمڕوانی، قەرەباڵغیەکە ئێستا کوشندە و مایەی بێزارییە.. دایکم لەتەنیشتمەوە بوو دوعای دەکرد، ئەو کچێکی چاك و گوێڕایەڵە، نەمبینیوە هەرگیز کاتەکانی بەفیڕۆ بدات.

لەدەرگای دەرەوەی نەخۆشخانەکە چوینە ژوورەوە، ئەمە نەخۆشێکە هاوار دەکات، ئەمەش بریندارە بەکارەساتی ئۆتۆمبێل، سێهەم چاوەکانی زەق بونەتەوە و نازانێت خەڵکی دونیایە یان ئاخیرەت، دیمەنێکی سەیر بوو پێشتر نەمبینیبوو.

خێرا بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین، ئەو لە ژووری چاودێری تایبەتیدا بوو، پەرستیارەکە پێی وتین: ئەتانبەم بۆلای... پەرستیارەکە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو: ئەو کچێکی چاکە و لەدوای لەهۆشخۆچونەکەی بەرەو باشی دەڕوات، نابێت لەیەك کەس زیاتر سەردانی بکات، ئەمە ژووری چاودێری تایبەتە.

لەنێو قەرەباڵغی دکتۆرەکان و لە پەنجەرەیەکی بچوکی نێو دەرگاکەوە نورەی خوشکمم ئەبینی تەماشام دەکات و دایکیشم لە

تەنیشتیەوە وەستابوو، دوای دوو خولەك دایكم هاتە دەرەوە و نەیتوانی فرمێسكەكانی بشارێتەوە... رێگەیان بەمن دا كە بچمە ژوورەوە و سڵاوی لێ بكەم بەمەرجێك زۆر قسەی لەگەڵ نەكەم، وتیان: دوو دەقیقە بەسە بۆتۆ.

نورە چۆنیت؟ دوێنێ ئێوارە باش بویت؟ بۆوات لێ هات؟

دوای ئەوەی توند دەستی گوشیم وەڵامی دامەوە: سوپاس بۆخوا ئێستا باشم... سوپاس بۆ خوا بەڵام دەستی تۆ ساردە... لە لێواری چارپایەكەیدا دانیشتبووم و دەستم بەر قاچی كەوت، دووری خستەوە.

وتم: ببورە ئازارم دایت.

وتی: نا، نەخێر، بەڵام بیرم لەو وتەیەی خوای گەورە دەكردەوە كە دەفـــــەرموێت: ﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴿٣٠﴾﴾ القيامة: ٢٩-٣٠.

وتـــی: هـــەنا دوعـــام بـــۆ بكـــە لەوانەیـــە بـــەم نزیكانـــە پێشـــوازی لەیەكـــەم رۆژی ئـــاخیرەت بكـــەم، گەســـتەكەم دوور و درێژە و توێشووم كەمە.

دوای بیســـتنی قســـەكانی فرمێســـك بـــە چـــاوەكانمدا هاتـــە خـــوارەوە و دەســـتم كـــرد بـــە گریـــان، نەمئـــەزانی مـــن لـــە كـــوێم، چـــاوەكانم لـــەگریان بـــەردەوام بـــوو، بـــاوكم وای لـــێ

مات لەنورە زیاتر لێم دەترسا، چونکە ئەوان بەم گریان و پەرگیریەی من رانەهاتبوون.

لەگەڵ خۆرئاوابوونی ئەو رۆژەدا بێدەنگیەکی درێژ ماڵەکەمانی داگرت، کچی پورێکم هاتە ژوورەوە بۆلام، کچە پورەکەی ترم، رووداوگەلێکی خێرا.

ئەوانەی دەهاتن ژمارەیان زیادی دەکرد، دەنگەکان تێکەڵ بوون، یەك شتم زانی، نورە کۆچی دوایی کردوە، ئەمئەتوانی میوانەکان لەیەکتر جیابکەمەوە، ناشزانم چی ئەڵێن، خوایەگیان من لەکوێم و چی رووئەدات؟!..

تەنانەت گریانیش، نەمئەتوانی بگریم.

دوای چەند رۆژێك هەواڵیان پێدام کە باوکم دەستی گرتوم و بردوومی بۆلای خوشکەکەم تاوەکو دوا خواحافیزی لێ بکەم، وە منیش ماچم کردووە، تەنها شتێکم بیر دەهاتەوە، کاتێك لاشەکەیم لەسەر جێگە مردنەکەی بینی راکشابوو، قسەکەی ئەوم بیرهاتەوە کە ئەم ئایەتەی بۆم خوێندەوە ﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ واتە: (ئیتر قاچەکان بەیەکدا دەئاڵێن). ئەوکاتە حەقیقەتی ئەوەم زانی کە ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ٣٠﴾ واتە: ئەوساو لەو رۆژەدا بۆ لای پەروەردگارت

دەبڕێیـــت). ئەوەشـــم زانـــی کـــە مـــن بـــۆ بـــەرماڵ و شـــوێنی نوێژکردنەکـــەی ئـــەو گەڕاومەتـــەوە، لەوێـــدا بـــیرم کەوتـــەوە کـــە کـــێ بـــوو ســـکی دایکمـــی لەگەڵـــدا بەشـــکردبووم، چـــونکە ئێمـــە دووانـــە بـــووین... بـــیرم کەوتـــەوە کـــە کـــێ بـــوو ئـــەوەی بەشـــداری خـــەم و خەفـــەتی دەکـــردم و ناڕەحەتیـــەکانی کـــەم دەکردمـــەوە و دوعـــای هیدایـــەتی بـــۆ دەکـــردم... کـــێ بـــوو شـــەوانێکی زۆر فرمێســـکی دەڕژانـــد و باســـی مـــردن و حیســـابی دوای مردنـــی بـــۆ دەکـــردم، خوایارمـــەتی دەرە، ئەمشـــەو یەکـــەم شـــەوێتی لـــە گۆڕەکەیـــدا، خوایـــە گیـــان بـــەزەیت پێـــدا بێتـــەوە و گۆڕەکـــەی بـــۆ ڕوونـــاك کـــەرەوە، ئەمـــە قورئانەکەیـــەتی، ئەمـــەش بەرماڵەکەیـــەتی، ئەمـــەش.. ئەمـــەش.. بـــەڵکو ئەمـــە ئـــەو جلـــە ڕەنـــگ گوڵیەیـــەتی کـــە دەیگـــوت بـــۆ کـــاتی شـــوکردنەکەم هـــەڵی دەگـــرم، ئـــەوەم بیرکەوتـــەوە و بـــۆ ڕۆژانـــی ڕابـــردووی خـــۆم گریـــام، گریـــام.. گریـــانێکی بـــەردەوام، لـــە خـــوای گـــەورە پاڕامـــەوە کـــە بـــەزەیی پێمـــدا بێتـــەوە و تەوبـــەم لێ وەربگرێـــت و لـــێم خـــۆش ببێـــت، داوام لـــە خـــوای گـــەورە کـــرد کـــە لـــە گۆڕەکەیـــدا دامـــەزراوی بکـــات وەك چـــۆن خـــۆی حـــەزی لـــەو دوعایانـــە دەکـــرد.. لـــەپڕ لـــەخۆمم پرســـی: چـــی دەبـــوو ئەگـــەر مردووەکـــە مـــن

بوبـــام؟ دواڕۆژم چـــی ئـــەبوو؟ لەترســـاندا بـــیرم لـــە وەڵامەکەی نەکردەوە.

تێـــر تێـــر گریـــام.. الله اکـــبر ... الله اکـــبر... ئـــەوە بـــانگی بەیانییـــە بـــانگ دەدات، بـــەڵام ئـــەمجارە چـــەند بەلەزەتـــە، کـــە وتـــەکانی بانگدەرەکـــەم دووبـــارە دەکـــردەوە هەســـتم بـــە دڵنیـــایی و ئاســـودەیی دەکـــرد، خـــۆم پێچـــایەوە و وەســـتام بـــۆ ئەنجامـــدانی نوێـــژی بـــەیانی، نوێـــژم کـــرد وەك نوێـــژی خواحـــافیزی هـــەروەك چـــۆن پێشـــتر خوشـــکەکەم ئـــەنجامی دا و دوانوێـــژی بـــوو، وام لـــێ هـــات کـــە ڕۆژ دەبویـــەوە چـــاوەڕوانی ئێـــوارەم نـــەدەکرد، و ئەگـــەر ئێوارەشـــم بەســـەردا بهاتایـــە چـــاوەڕوانی ســـبەینێم نەدەکرد.

## گومانی حەوتەم:

## مۆدێلە و باڵاپۆشی نیە

هەندێك لەو خوشكە بەڕێزە بێ لەچكانە گومانێك باس دەكەن و دەیلێنەوە ئەویش ئەوەیە كەوا هیچ باڵاپۆشیەكی حەقیقی نیە، بەڵكو ئەم هەمووە لەبەر خاتری مۆدە و مۆدێلە، وە ئەگەر مۆدێلیش بێت لەبەر چی من پێوەی پابەند بم؟ ئینجا چەند ڕووداوێكت بۆ باس دەكات لەگەڵ چەند دیمەنێكی ناشەرعی كە هەندێك لەو خوشكە باڵاپۆشانە ئەنجامیان داوە و ئەمیش دە یان ناسێت.

لێرەدا پێویستە جۆرەكانی ئافرەتی باڵاپۆش دیاری بكەین پێش ئەوەی وەڵامی ئەم گومانانە بدەینەوە كە شەش جۆرن:

١.هەندێك خوشك باڵاپۆش دەبن لەپێناو شاردنەوەی هەندێك لە ناتەواویە جەستەییەكانی خۆیاندا.

٢.هەندێك لەپێناو شووكردندا خۆی باڵاپۆش دەكات، چونكە زۆربەی كوڕە لاوەكانمان پابەندن بە دینەوە، یان پابەند نین بەڵام ئافرەتانی باڵاپۆشیان بەلاوە باشترە وەك پێشتر رونمان كردەوە.

٣.هەندێك لەو ئافرەتانە بۆیە باڵاپۆش دەبن تاوەكو هەندێك لە كردەوە خراپ و حەرامەكانی خۆیانی پێ پەردەپۆش بكەن، چونكە بەهۆی ئەو جلە داپۆشراوانەوە كەسوكاری متمانەیان پێ دەكەن و چیتر گومانیان لێ ناكەن، ئینجا لەدواییدا هەركاتێك و بۆ هەركوێیەك بیانەوێت ئەتوانن بچنە دەرەوە و كەس ڕێگریان لێ ناكات.

٤.هەندێك لەبەر مۆدە جلی باڵاپۆشی لەبەر دەکەن، ئەم مۆدەیەش پێی دەڵێن: (باڵاپۆشی فەڕەنسی)، ئەویش جۆرێکە "کە چەند تاڵێك لە قژی و گەردنی دەردەخات، جارێك بەهۆی تەنکی جلەکەیەوە کە جەستەی د یار دەبێت، و جارێك بەهۆی لەبەرکردنی پانتۆڵەوە، و بۆ تەواوکردنی مۆدێلەکە جۆرەها دەرمان لە دەموچاوی دەدات و بڕێکی زۆر لە عەتر لەخۆی دەدات بەجۆرێك ئەو ڕێگایە بۆندار دەکات کە پیایدا گوزەر دەکات، ئەم کچە یان ئەم ئافرەتە پشتی لە باڵاپۆشی شەرعی کردووە و باوەڕی وایە کە شەرعی خەڵك لە شەرعی خوا چاکترە، شەرعی خەڵکیش لە نمونەی (کرستیان دور) و (ڤالنتینۆ) و (سان لۆران) و (شانال) و (مارتێز) و ئەوانی تر لەو کافرانەی کە خوای گەورە رقی لێ گرتوون.

٥.هەندێکی تریان بەزۆر ئەو جلانەیان لەلایەن دایك و باوکیانەوە لەبەر کراوە کە پابەندن بە دینەوە، بۆیە ئەویش بەنابەدڵی ئەو جلانەی لەبەر کردووە و حەزی لێ ناکات، وە لە ترسی ئازاری کەسوکاریشی جلەکان فڕێ نادات، بۆیە ئەم پۆلە لە ئافرەتان هەر کە دەرفەتێکیان بۆ بلوێت و چاودێر بەسەریانەوە نەمێنێت هەموو ئەو جلانە فڕێ دەدەن، چونکە باوەڕ و قەناعەتیان بە باڵاپۆشی نییە.

٦.هەندێکی تر جلی باڵاپۆشی دروستی شەرعی لەبەر دەکەن، ئەم جۆرە لە خوشکان ئیمانیان بە واجب بوونی باڵاپۆشی هەیە و

لەترسی خوای گەورە جلە بالاپۆشیەکەیان فڕێ نادەن نەك لەبەر خەلکی، وە پابەندن بە تایبەتمەندییە شەرعیەکانی بالاپۆشیەوە کە ئەمانەن:

أ- جلەکە ئاوەدان و فراوان بێت و هیچ پارچەیەك لە لەشی دەرنەخات.

ب- جلەکە ئەستور بێت و هیچ شوێنێکی لاشەی بەدەرەوە نەبێت.

ج- جلەکە بۆنی عەتر و بوخورد و میکیاجی پێوە نەبێت.

د- جلەکە لە جلوبەرگی کافران نەچێت، لەپێناو سەرپێچی کردنیاندا.

ه- جلەکە رەنگەکەی سەرنجڕاکێش نەبێت، یان خۆی لە خۆیدا جوانییەك بێت.

و- جلەکە هەموو جەستە بگرێتەوە جگە لە دەم و چاو و هەردوو دەست (لە بۆچونێکدا) و هەموو جەستە (لە بۆچونێکی تردا).

ز- جلەکە لە جلوبەرگی پیاوان نەچێت، چونکە نەهی کراوە لە لاسایی کردنەوەی پیاوان.

ح- جلەکە جلوبەرگی ناوبانگ نەبێت، تاوەکو لەخۆی بایی نەبێت و شانازی پێوە بکات، ئەوەش نەهی لێ کراوە.

خۆ ئەگەر ئەم هەموو جۆرە جلانەی باسکران جگە لە جۆری شەشەم لەبەرخاتری خوا نەبوو، ئەمە مانای ئەوە نیە کە هیچ

ئافرەتێك نیە كە جلی باڵاپۆشی لەبەر خوا لەبەر بكات. دە تۆش لەو پۆل و كۆمەڵە بە كە لەبەر خاتری خوای گەورە پابەندن بەو جلانەوە و داوای رازی بوونی ئەو دەكەن و لە تورەبوونی ئەو دەترسن.

## گومانی هەشتەم:

## بێبەشبوون لە جوانی

ئەمەش دیسان پێی ناوترێت گومان، بەڵکو لەجۆری حەز و ئارەزووە و رێگرە لە پابەندبوون بە باڵاپۆشییەوە.

ئەو پرسیارەش کە رووبەڕووی ئەم ئافرەتانە دەبێتەوە ئەوەیە: بۆکێ سەر و سنگ و قاچت رووت دەکەیت؟ بۆ کێ خۆت دەڕازێنیتەوە؟ ئەگەر وەڵامەکە ئەمە بێت: "تاوەکو هەموان باڵا و جوانیم ببینن".

ئایا رازی دەبیت ئەم جوانییە هەموو دەروون نزم و کەسێکی خراپ ببیبینێت؟ ئایا رازی دەبیت وەك شمەکێکی هەرزان کەسانی چاك و خراپ مامەڵەت لەگەڵ بکەن؟ چۆن جەستەی خۆت لە مرۆڤە گورگ ئاساکان دەپارێزیت؟ رازی دەبیت هێندە نزم و هەرزان بیت؟!.

**چیرۆکێکی واقیعی:**

ئافرەتێکی سەماکەر کە هونەرمەندێکی بەناوبانگ دەبێت سەردانی یەکێك لە وڵاتانی کەنداو دەکات بەمەبەستی بەشداری کردن لە ئاهەنگی شەوانەی چەند بۆنەیەك، یەکێك لە ئافرەتە چاك و لەخوا ترسەکان بڕیار ئەدات بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ ئەم هونەرمەندەدا بکات و

فەرمانی بە چاکە پێ بکات و خراپەشی لەلا ناشرین بکات، بۆیە لەو میوانخانەیەی کە هونەرمەندەکەی تێدا دابەزیووە دەگەڕێت بەدوای ژمارەی تەلەفۆنەکەیدا و وازناهێنێت تاوەکو دەستی دەکەوێت، پەیوەندی پێوە دەکات و ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا ڕوودەدات.

+خوشکە لەخوا ترسەکە: بەخێربێیت بۆ وڵاتەکەمان، خۆشحاڵین لەسەر خاکی خۆمان دەتبینین، داوا ئەکەم ڕێگەم بدەیت پرسیارێکت لێ بکەم.

ئافرەتە هونەرمەندەکە: فەرموو، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە.

+گەر شتێکی گرانبەهات هەبێت لەکوێ هەڵی دەگریت؟

- لە جێگایەکی تایبەت و دەرگاکەی لێ دەگرم تاوەکو کەس نەیبات.

+ ئەی ئەگەر ئەو شتە زۆر گرانبەها بوو لەکوێ دەیشاریتەوە؟

- لە جێگەیەکی زۆر تایبەتیدا بەجۆرێك هیچ دەستێکی پێ نەگات.

+گرانترین شتێك کە ئافرەت خاوەنیەتی چیە؟

هونەرمەندەکە دوودڵ بوو لە وەڵامدانەوەدا.

بۆیە خوشکەکە پێی وت: ئایا گرانترین شتی ئافرەت داوێنپاکی نیە؟

– بەڵێ.. بەڵێ، گرانترین شتێك کە ئافرەت خاوەنی بێت داوێنپاکیە.

+ ئایا ئەم شتە گرانبەهایە ئەکرێت و ئەبێت پیشانی هەموو کەسێکی بدەیت؟

لێرەدا هونەرمەندەکە لە ناوەڕۆك و مەبەستی گفتوگۆکە تێدەگات و زۆر بە سەرسوڕمانەوە (وەك کەسێك بە دەنگێکی بەرز بانگ لە ناخ و فیترەتی بکات و هەموو جەستەی بهێنێتە لەرزە و لەو سوبات و سڕبوونە خەبەری بکاتەوە) دەڵێت: ئەمە یەکەم جارمە لە تەمەنمدا لەم جۆرە قسانە ببیستم، بۆیە ئێستا هەر ئەبێت چاوم پێت بکەوێت، وە ئەبێت من زیاتر گوێ لەم جۆرە قسانە بگرم. (تەواو)

خوشکی گران و خۆشەویستم، گەر لەبەرخاتری مێردەکەت یان هاوڕێ ئافرەتەکانت، جلە داپۆشراوەکانت لادەبەیت و خۆت جوان دەکەیت، ئەوا ئیحراجی لە

ئایینـدا بـۆ ئـەو مەبەسـتە نیـە، ئەگـەر ئـەو کـارە لـە دەرەوەی مـاڵی خـۆت و مێردەکـەت نـەبێت، ئاسـاییە لەبەرچـاوی هـاوڕێ ئافرەتـەکانت جلـەکانت کـەم بکەیتـەوە ئەگـەر ئامـادە بـووان هـەموویان ئـافرەت بـن و ئـەو شـوێنانەش بـەدەر نەکـەوێت کـە بـۆ ئـافرەتیش نیـە بیانبینێت کە ئەوەش لە نێوان ناوك و ئەژنۆدایە.

نمونەیەك لە واقیعدا:

خوشکی گـەورە و گرانم: ئایا دێت بە بیر و یادتدا کڕیار چۆن شـتەکان ئەمدیوئـەودیو دەکـات کاتێـك بیـەوێت بیکڕێـت؟ وە دوای ئـەوەی شـتەکەی بـەدڵ بـوو داوا لـە فرۆشیارەکە دەکـات دانەیـەکی پێچـراوەی پـێ بـدات لـە هـەمان جـۆر لەوانـەی کـە سـەفتە کـراون و دەسـتی پـێ نەگەیشـتووە، جـوان بـیر لـەم نمونەیـە بکـەرەوە ئینجـا دەزانیـت چـەندە بـەڕێز و گران دەبیت کاتێـك ئـەوەی خـوا فـەرمانی پـێ کردویـت بۆداپۆشـین دایدەپۆشیت.

## گومانی نۆیەم:

## باڵاپۆشی نیوەی کۆمەڵگا پەکدەخات

ئـەم گومانـە ئافرەتـان باسـی ناکـەن و نایڵێنـەوە، بـەڵکو عەلمانیـەکان و شـوێنکەوتەکانیان دەیڵێنـەوە و دووبـارەی دەکەنـەوە، ئـەوان دەڵـێن: باڵاپۆشـی ئـافرەت نیـوەی کۆمـەڵگا پەکـدەخات، چـونکە بـەو هۆیـەوە ئیسـلام فـەرمان بـە ئـافرەت دەکات لەماڵدا بمێنێتەوە.

ئـەم گومانـە کـە نـاو بـە نـاو دەبیسـترێت وەڵام گـەلێکی زۆری هەیە، لەوانە:

١ـ راسـتە چـاکتر وایـە کـە ئـافرەت لـە ماڵـەوە بێـت، وەك خـوای گـــــەورە دەفـــــەرموێت: ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ الأحـزاب: ٣٣. واتـــە: ((ئـــەی هاوســـەرانی پێغەمبـەر (ﷺ) ئافرەتـانی موسـوڵمان) لەماڵـەکانی خۆتانـدا بەسـەنگینی و سـالاری بسـرەون، زینـەت و جـوانی خۆتـان دەرمەخن وەکوو سەردەمی نەفامی یەکەم).

ئـەم فەرمانـە خواییـە مانـای بچـوککردنەوە یـان پەکخسـتنی وزەی ئافرەتـان ناگەیـەنێت، بـەڵکو شـیاوترین شـێوازی بەکارهێنانی وزەی ئافرەتانە.

٢ــ ئیسلام دەڵێت: گرنگترین ئەرکی ئافرەت بریتیە لە پەروەردە و چاودێری منداڵ و فێرکردنیانە بە رەوشت و بەهای جوان.. سەرژمێرییە ناوخۆیی و جیهانیەکانیش هەرهەمویان دەڵێن: هۆکاری سەرەکی لادان و سەرلێشێواوی لاوان بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزانی دەگەڕێتەوە، کەلەئەنجامدا چاودێری دروست و تەواو بۆ منداڵ نامێنێت.

٣ــ ئیسلام خەرجی ماڵ و منداڵی نەخستۆتە ئەستۆی ئافرەت، بەڵکو هەموو خەرجیەك لە ئەستۆی پیاودایە، بۆیە سروشتیە ئەوەی لەماڵ دەردەچێت بۆ کارکردن پیاو بێت، تاوەکو ئافرەت بواری بۆ کارێکی گرنگتر لەکاری دەرەوەی ماڵ بۆ بڕەخسێت کە گەورەترین کارە لە کۆمەڵگادا، ئەویش پەروەردەکردنی نەوەیە کە کۆمەڵگاکان لەسەر شانی ئەوان بنیات دەنرێن و گەشە دەکەن.

٤ــ ئیسلام زۆر جەخت لەسەر پاراستنی کۆمەڵگە لە داڕوخان و لەناوچوون دەکاتەوە، کە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی پیاوان و ئافرەتانەوە دەبێت، چونکە لەو تێکەڵبونەوە کۆمەڵێك گرفت پەیدا دەبێت کە کۆمەڵگا لاواز دەکات، ئافرەتان توشی ئازار دەبن لەلایەن هەندێك لەدەروون لاوازەکانەوە،

هـــەروەها دەروونـــی ژن و پیـــاوی قـــەیرە ســـەرقاڵ دەبێـــت بەیـەکترەوە، بـەجۆرێك هـیچ سـودێك بـۆ کۆمـەڵگا بـەجێناهێڵێ، بەتایبـــەتی کاتێـــك کـــە جلـــی رووت و جوانکـــاری لـــەنێوان ئافرەتاندا تەشەنە دەکات .

٥ــ ئیسـلام رێگــە لــە کــارکردنی ئافرەتــان ناگرێــت، بــەڵکو ئـەیکات بـە ئـەرك و واجـب لەسـەری گـەر لـە کـار و پسـپۆڕیەکدا بێـت کـە کۆمـەڵگا پێویسـتی پێـی هـەبێ، بـۆ ئـەوەی حـەرەج و دڵـەراوکێ نـەهێڵێت و ئـافرەت ناچـار نـەبێت جـوانی خـۆی بـۆ پیـاوی بێگانـە ئاشـکرا بکـات. بۆنمونـە ئافـەرەتەکـە پزیشـکی ئافرەتـــان بێـــت، یـــان مامۆســـتا بێـــت، یـــان وێنـــەی تیشـــکی ئافرەتـان بگرێـت، یـان مامـان بێـت یـان کـاری تـر کـە تایبـەتـە بـە ئافرەتانەوە ئەنجام بدات.

٦ــ لەحاڵــەتی ناچاریشــدا ئیســلام رێگــر نیــە لــە کــارکردنی ئافرەتـانـدا، ئەگـەر ئافرەتەکـە پابەنـد بێـت بـە ئـاداب و نـەریتی شـەرعیەوە وەك مۆڵـەت وەرگـرتن لـە بـاوك و دایـك یـان مێـرد، یـان تێکـەڵ نـەبوونی پیـاوان و بەتـەنها نەمانـەوە لەگەڵیانـدا لەشـوێنی کارەکـەدا، وە خـودی کارەکـەش تـاوان و یـاخی بـوونی خـودای تێـدا نـەبێت، واتـە کـارێکی گونجـاو و شـەرعی

بێت، و پێچەوانەی عورف و نەریتی سروشتی ئافرەتان نەبێت، هەروەها کارەکەی نەبێتە هۆی پەکخستنی کاری دایکایەتی لە ماڵەکەیدا و چەند مەرجێکی تر لەو جۆرە.

## گومانی دەیەم:

## بالاپۆشی رواڵەتێکی ناشارستانییە

دەڵێن شێوازی دەرەوەی جلی بالاپۆشی لە رواڵەتی کۆمەڵگا دواکەوتووەکان دەچێت، شێوە و شێوازەکەی شارستانی نیە، ئەم قەلە رەش و خێوەتە رەشە جوڵاوانە چ مانایەکیان هەیە؟ ئەمە گەڕانەوەیەکە بۆ سەرەتاکانی کومەڵگا مرۆییە دواکەوتووەکان.

دەستەواژەگەلێکی هەڵە:

ئەم گومانە خۆی لە خۆیدا رووخاوە، چونکە پێشکەوتن بەرواڵەتی دەرەوە ناپێورێت، وەك جلوبەرگ و خانوو و ولاخ و زەخرەفە و هیتر لە کارە رووکەشییەکان، ئەو کەسەش کە پێشکەوتنی کۆمەڵگا بە رواڵەتی دەرەوە دەپێوێت، ئەوە راستییەکانی ون کردووە.

شارستانیەت وشەیەکە بەکۆی رەوشت و رەفتار و بەهای گەلێك لە گەلان دەوترێت، وە رواڵەتی دەرەوەش پەیوەندی بە شارستانیەتەوە نیە، بەڵکو ئەوە لە مەدەنیەتدایە.

چەند نمونەیەك لە واقیعدا:

بۆ نمونـە كاتێـك دەچیتە وڵاتـی ئەمـەریكا، ئـەوا لـە واقیعـدا و بەچـاوی خـۆت حكومـەت و خـەڵكی دەبینیـت كەچۆن ڕێـز لـە ئـازادی دەگـرن و بـەپیرۆزی دەزانن،تەنانـەت پەیكـەرێكیان لـە ناوەڕاسـتی گـەورەترین شـاری ئەمـەریكادا دروسـت كـردووە وەك نیشـانە و نمونەیـەك بـۆ ئـازادی، هـەر هاوڵاتیـەكی ئەمـەریكیش ئـەتوانێت ڕەخنـە لـە هەركەسـێك بیـەوێت بگرێـت لـە سـەرۆكی ئەمـەریكاوە تـاوەكو بچـوكترین كارمەنـد، بـەبێ ئـەوەی ڕێگـەی لێ بگیرێـت یـان سـزایەك بـدرێت یـان لەلایـەن كەسـێكەوە لۆمـە بكرێـت، ئـازادی بۆخـۆی بەهایەكـە لـە بـەهاكان، بۆیـە كاتێـك ئەمـەریكا دەبێـت بـە پێشـەنگی جیهـان تـەنها بـەهۆی تەكنەلۆجیاكەیـەوە نیـە، بـەڵكو بـەهۆی ئەوەوەیـە كـە خـاوەن بەهایـەكی مرۆڤایەتیـە و حكومـەت پـێش گـەل پارێزگـاری لـێ دەكات.تەنانـەت ئـەو حكومەتانـەی كـە بـەدوای یەكـدا دێـن لـە ئەمـەریكادا سـەركەوتن و سـەرنەكەوتنیان پەیوەسـتە بـە بـڕی ڕێزگـرتن لـەم بەهایانـە و پراكتیكە كردنیان لە واقیعدا.

نمونەیـەكی تـر: لـە هـەر وڵاتێكـی ئەوروپیـدا كاتێـك بـۆ هـەر وێستگەیەكی پـاس دەڕۆیـت خشـتەیەكی هەڵواسـراو دەبینیـت كـە كـاتی گەیشـتنی پاسـەكانی تێدایـە بـە درێـژایی هەفتـە و بە سـەعات

و بــه خولـــەك، بۆنمونـــه كـــاتی یەكـــەم پـــاس ئەنوســـن رۆژی دووشــەممە ســەعات ٦:٤٥ی ســەر لــه بــەیانی، هــاوڵاتی كاتێـك بـۆ ئـەو شـوێنه دەچـێت پاسـەكە دەبینێـت لـه هــەمان خولەكـدا و بـەبێ دواكـەوتن ئامادەیـە، خـۆ ئەگـەر چـەند خولـەكێك دوا بكـەوێت، ئـەوا لــه هــەموو لایەكــەوە ســكاڵای لەســەر تۆمــار دەكرێــت و لەوانەیــە لەســـەر كارەكەشـــی لاببرێـــت، یـــان لەوانەیـــە قـــاڵێكی راگەیانـــدنی لەكۆمەڵگادا لێ بكەوێتەوە.

كــەوابوو رێزگــرتن لــه كــات بەهایەكــه لــه بــەهاكان، بۆیــه پێشـكەوتنی ئـەورووپا و شارسـتانیەتەكەی تـەنها بـه بـڕی ئـەو تەكنەلۆجیایـه ناپێورێـت كـه خاوەنیـەتی، بـەڵكو بـەو بـەها و پرەنسیبانەوە پێوانه دەكرێت كه پارێزگاری لێوە دەكات.

كۆمــەڵگای خۆشمــان بـه بــەراورد لەگــەڵ ئەوانــدا بەدواكــەوتوو دائـــەنرێت، ئەمـــەش نـــەك تـــەنها لەبـــەر ئـــەوەی خـــاوەنی تەكنـەلوجیا نـین، بـەڵكو بـەهۆی ئەوەشـەوە كـه وازمـان لـه بـەها و پرەنســـیبەكان هێنـــاوە، كـــه سەرچاوەكەشـــی ئـــەم ئایینـــه گــەورە و گرانـــەی خۆمانـــە، وە كۆمەڵگاكـــەمان لـــەڕیزی ئـــەو كۆمەڵگایانـــه دادەنرێـــت كـــه زوڵـــم و ســـتەمی تێـــدا دەكرێـــت و مافـەكانی مرۆڤـی تێدا پێشـێل دەكرێـت، هــەروەها لــەلای ئێمــه یاسـا سـەروەر نیـه و پشـت لـه شـورا كـراوە و گـوێ لـه رای كەسی تر ناگیرێت.

بۆیـه پابـه نـدبوون بـه جلوبـەرگی ئیسـلامیەوە خـۆی لـه خۆیـدا هەنگاونانـه بـۆ پێشـەوە لەرێگـەی دروسـتکردنی شارسـتانیەتدا، چـونکه باڵاپۆشـی ئـافرەت رەوشـت و رەفتـار و بەهایـەکی هـەڵقوڵاوە لـه ئایینـه پاکەکەمانـەوە، نـەك وەك ئـەوەی ئـەوان ئەیڵێن کەوا رواڵەتێکی ناشارستانیه.

## گومانی یانزەیەم:

## باوك و دایك و مێردەکەم ڕێگەم لێ دەگرن

ئەسڵ لەم باس و خواستەدا ئەوەیە کە گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ خوای گەورە لەپێشەوەی هەمولملکەچی‌یەکە بۆسەرجەم دروستکراوەکانی تر هەر کەس و دروستکراوێك بێت، ، دایك و باوك لەداوی خوای گەورە لەهەموو کەس زیاتر شایەنی گوێرایەڵین، بەڵام بەمەرجێك فەرمان بە گوناهو تاوان و سەرپێچی نەکەن.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە سەرپێچی دایك و باوك یان مێرد لەشتێکدا کە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات بە گەورەترین چاکە و نزیکبونەوە دادەنرێت لە خوای گەورەوە، هەروەها ئەم کارە خۆی لە خۆیدا بانگ کردنی دایك و باوك و مێردە بۆلای دینی خوا و بەرنامەی خوا.

خاڵی سێیەم: باوك یان مێرد کاتێك ئەوەی ژێر دەستی خۆی بینی کە زۆر سورە لەسەر باوەڕ و بۆچونەکەی زۆرجار ئەویش ملکەچی واقیعەکە دەبێت و ڕێز لە بۆچوونی کوڕ یان خێزانەکەی دەگرێت، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە دڵی هیچ خۆشەویستیەکی ڕاستەقینەی تێدا نەبێت بەرانبەر منداڵ یان خێزانەکەی.

لێرەدا هەندێك لە فەتوای زانا گەورەکان بۆئەم باسە دەخەینە روو:

پرسیاری یەکەم: بەڕێز ماموستا (بن باز) وەڵامی دەداتەوە.

پرسیار: ئایا گوناهبار ئەبم گەر گوێڕایەڵی دایکم نەکەم لەوەی کە داوای ئەوەم لێ دەکات کە جلی باڵاپۆشی فڕێ بدەم و جلی نیوە رووت لەبەر بکەم، هەروەها فەرمانم پێ دەکات کە بچم بۆ ئاهەنگەکان بە جلی ناشەرعیەوە لەو جلانەی کە هەموو جەستە دەردەخات؟ و هەرکاتێك بە جلی باڵاپۆشیەوە دەمبینێت لێم تورە دەبێت.

وەڵام: نابێت گوێڕایەڵی کەسێك بکەیت کە سەرپێچی فەرمانی خوا بکات با ئەو کەسەش باوك یان دایك بێت، لە فەرمودەیەکی راستدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (إنَّمـا الطَّاعَـةُ في المَعـروفِ). واتە: گوێڕایەڵی کردن لە کاری چاکەدایە. هەروەها فەرمویەتی: (لا طاعَـةَ للمَخلـوق في مَعْصية الخـالق) واتە: گوێڕایەڵی هیچ دروستکراوێك ناکرێت گەر لەخوا یاخی بوبێت. و ئەو داوایانەی کە دایکی ئەم خوشکە پرسیارکەرە داوای دەکات هەمووی تاوان و یاخی بوونە لە خوا، بۆیە نابێت لەوشتانەدا گوێڕایەڵی بکات.

**پرسیاری دووەم: بەڕێز مامۆستا (بن عوسەیمین) وەڵامی داوەتەوە.**

پرسیار: بەپێی بڕیارێك كە دەسەڵاتی سەرەوە دەریكردوە لە وڵاتە ئیسلامییەكەی مندا كچان و سەرجەم ئافرەتان نابێت جلی باڵاپۆشی لەبەر بكەن بەتایبەت سەرپۆش لەسەركردن، ئایا دەبێت من ئەو بڕیارە جێبەجێ بكەم؟ لەكاتێكدا هەركەسێك ئەو بڕیارە جێبەجێ نەكات سزا دەدرێت بە دەركردن لە كارەكەی یان قوتابخانەكەی یان زیندانی دەكرێت.

وەڵام: ئەو بەڵایەی لە وڵاتەكەی تۆدا روویداوە لەو رووداوانەیە كە بەندەی خوای پێ تاقی دەكرێتەوە، و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٣﴾ العنكبوت: ١-٣. ئەوەی من ئەیبینم پێویستە لەسەر ئافرەتانی موسڵمانی ئەو وڵاتە لەم كارە خراپەدا ملكەچی دەسەڵات نەبن، چونكە نابێت گوێڕایەڵی خاوەن دەسەڵات بكەیت لەكاری خراپەدا، خوای

گــــەورە فەرمویـــــەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ النساء: ٥٩.

ئەگــەر لــەم ئایەتــە ورد بیتــەوە خــوای گــەورە فــەرمانی (أطیعــوا)ی لــە ســێهەم جــاردا لەگــەڵ (اولی الأمــر)دا دووبــارە نەکردۆتــەوە، ئەمــەش بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی گوێڕایــەڵی کاربەدەســتان بەســتراوە بــە گوێڕایــەڵی ئەوانــەوە بــە فەرمانــەکانی خــوا و پێغەمبــەرەوە ﷺ، واتــە: ئەگــەر فــەرمانی ئــەوان سەرپێچی کــردن بێــت لــە فەرمانــەکانی خــوا و پێغەمبــەر ﷺ ئــەوا نابێــت گوێیــان لێ بگیرێــت و گوێڕایــەڵیان بکرێــت، و گوێڕایــەڵی هــیچ دروســتکراوێك ناکرێــت ئەگــەر دروســتکراوەکە لەخوا یاخی بوبێت.

و دەربــارەی ئــەو ئــازار و ناخۆشــیەی کــە توشــی ئافرەتــان دەبێــت لــەو شــوێنەدا، ئــەوا دەبێــت دان بــە خۆیانــدا بگــرن، بــۆ ئــەو ســەبر و ئارامگرتنــەش پشــت بــە خــوای گــەورە ببەســتن، داوا لــە خــوای گــەورە دەکــەین کــە هیدایــەتی کاربەدەســتانی ئەوانیش بدات بۆ ڕێگەی حەق و ڕاستی.

مــن وائــەزانم ئــەم بڕیــارە تــەنها بەســەر ئەوئافرەتانــەدا جێبــەجێ دەبێــت کــە دەچــنە دەرەوە، کەوایــە چــاکتر وایــە بــۆ ئافرەتــان نەچــنە دەرەوە تــاوەکو ســەلامەت بــن لــەو بەڵایــە، کورتــەی

وتەکــە ئەوەیــە کــە بــەهیچ جۆرێــك نابێــت گوێڕایــەڵی کاربەدەستان بکرێت لە کارە خراپەکاندا[1].

پرسـیاری سـێیەم: بـەڕێز مامۆسـتا (بـن عوسـەیمین) وەڵام دەداتەوە.

پرسـیار: پیاوێـك ژنـی هێنـاوە و منـداڵی هەیـە، ژنەکـەی ئەیـەوێت باڵاپۆش بێـت و پیاوەکـەی ڕێگـەی پـێ نـادات، چۆن ئامۆژگـاری ئـەو پیـاوە دەکـەن؟ خـوا پاداشـتی خێرتـان بداتەوە.

وەڵام: ئێمـە ئامۆژگـاری ئـەو پیـاوە دەکـەین بـەوەی لـەخوا بترسـێت لـە بەرامبـەر مـاڵ و منداڵەکانیـدا و سوپاسـی خـوا بکـات کـە ژنێکـی وای پێداوە حـەز لـە جێبـەجێ کردنـی فـەرمانی خـوای گـەورە دەکـات بـە لەبـەرکردنی جلوبـەرگی شـەرعی، ئـەو جلـەی کـە بێگومـان لـە خراپـە و تـاوان دەیپارێزێـت، ئەگـەر خـوای گـەورە فـەرمان بـە بەنـدە ئیمانـدارەکان بکـات تـاوەکو خۆیـان و منداڵـەکانیان لـە ئـاگر بپـارێزن لـە ئایەتێکـدا کـە دەفـــــــــەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ

---

(١) فەتواکانی بن عوسەیمین ج٢/٨٧٠.

مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ التحـريم: ٦. و ئەگـەر پێغەمبـەر
ﷺ لێپرسـراوێتی مـاڵ و منـداڵی خسـتبێتە ئەسـتۆی پیـاوەوە
کە دەفەرموێت: ( الرجل راعٍ في اهله و مسؤول عَن رعيته).

واتـە: پیـاو شـوانی مـاڵ و منداڵەکەیـەتی و لێپرسـراوە
بەرامبەریان لە رۆژی دواییدا.

دەی کەوایە جێی خۆی نیە و جوان نیە بۆ ئەو پیاوە بەزۆر
ژنەکـەی ناچـار بکـات واز لـە جلـی شـەرعی بهێنێـت و جلـی
ناشـەرعی لەبـەر بکـات و ببێتـە هۆکارێـک بـۆ دروست بـوونی
فیتنـە و خراپـە بۆخـۆی و خـەڵکی تـریش، بـا لـە خـوا بترسێت و
سوپاسـی خـوا بکـات کـە ئـافرەتێکی بـەم جـۆرە پـاك و صاڵحی
پێ بەخشیوە.

دەربـارەی ژنەکـەش بـەهیچ جۆرێـك نابێـت و حـەڵاڵ نیـە بـۆی
کـە گوێڕایـەڵی مێردەکـەی بکـات لـەو تاوانـەدا، چـونکە
گوێڕایـەڵی کردنـی کەسـی یـاخی لـە فـەرمانی خـوا بەهیچ جۆرێك
نابێت و دروست نیە.

بـەکورتی: ئەمـە فـەرمانی شـەرعی خوایـە وەك زانـا
بـەڕێزەکانمان رونیـان کردۆتـەوە، بـەڵام لـەکاتی سەرپێچـی
کـردن لـە فـەرمانی مێـرد و کەسـوکاردا واچـاکە دانـایی و
حیکمـەت بـەکار بهێنرێـت، حیکمـەتیش ئـەم شـێوازانە
دەگرێتەوە:

١.ئەوەی باوەڕت پێی هەیە بە ئەدەب و ڕێزەوە ئاشکرای بکە و دەری بخە بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە یان بەکارهێنانی وشەگەلێك کە بەرامبەر توڕە دەکات.

٢.بە سنگێکی فراوانەوە بەرگەی ئەزیەت و ئازارەکان بگرە لە جوێن و قسەی ناشرین و گاڵتەجاڕی، بێزار مەبە و مامەڵەی خراپی بەرامبەرەکەت کارت تێ نەکات.

٣.لەدوای خوای گەورە داوای هاوکاری و یارمەتی لە خزمەکانت بکە لە ژنان و پیاوان ئەوانەی کە ڕێگای هیدایەتیان هەڵبژاردووە.

٤.یەکەمجار پشت بە خوا ببەستە، بەردەوام دوعای دامەزراوی و لابردنی ناڕەحەتیەکان بکە، بەردەوامبە لە قورئان خوێندن و زیکر و یادی خوادا بەتایبەتی لەو کاتانەی کە توشی جنێو و قسەی ناشرین و گاڵتەجاڕی دەبیتەوە تاوەکو بوار بۆ شەیتان نەمێنێت.

٥.ئەوەی کە باوەڕت پێیەتی وەك مامۆستا بەفیزەوە دەری مەبڕە و ئاشکرای مەکە، بەڵکو وەك قوتابیەك باسی بکە، چونکە باوك و دایك حەز ناکەن کچەکەیان وەك مامۆستایەك فیزیان بەسەردا بکات.

٦.خراپە بە چاکە و چاکەکاری وەڵام بدەرەوە.

٧.کاتی گونجاو بۆ گفتوگۆ لەو بارەیەوە لەگەڵ دایک و باوکتدا دیاری بکە.

٨.ئەو خوشکە بابزانێک کە بەهەشت شمەکێکی گرانبەهایە، بەدەستهێنانی شمەکی گرانبەهاش ماندوبوون و بەرگەگرتنی ئازار و ناڕەحەتی دەوێت لە ڕێگەی خوادا.

## دوا وتە:

کاتی خۆی کە ئیمپریالیزمی کافر هێرشیان کردە سەرمان و وڵاتیان داگیرکردین بزوتنەوە ئازادیخوازەکان لە هەموو لایەکەوە شۆڕشیان بەرپاکرد و دژیان وەستانەوە، دوای ئەوەی دوژمنان زەرەر و زیانێکی زۆریان لێ کەوت، بەو قەناعەتە گەیشتن کە شێوازی سەربازی سودی نیە و گەرمی بەرگری لە دەروونی خەڵکیدا زیاتر دەکات، بێگومان ئەوەش لە بەرژەوەندی ئەواندا نیە کە ئاواتیان دەستگرتنە بەسەر خێر و خێراتی وڵاتدا لە پێناو گەشەپێدانی وڵاتی خۆیاندا.

بۆیە پێش دەرچونیان لە وڵاتی ئێمەدا بیریان لە رێگە چارەیەکی تر کردەوە جگە لە رێگەی سەربازی، تالەدواییدا گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە باشترین رێگە بریتیە لە هێرش و شاڵاوی رۆشنبیری، ئەوەش بەوەی وا لە رۆڵەکانمان بکەن کە شوێنی نەریت و بەها و

کەلتوری ئەوان بکەون، بەوجۆرە دەبن بە خزمەتکاری ئەوان، ئەمەش بێگومان هاتەدی، دیارترین شتێک کە لەو هێرشە رۆشنبیریەدا جەختیان لەسەر کردبێتەوە ئافرەت بووە، ئەوان ویستیان ئافرەتانی ئێمە وەک هی خۆیان بێت، هاورێیەتی پیاوان بکات و بەردەوام تێکەڵی پیاوان بێت و لەهەموو شتێکدا کێبڕکێیان لەگەڵدا بکات، هەروەها جوانی و جەستەی دەربخات و لەگەڵ پیاواندا مەلە بکات.

لەپێناوی ئەم ئامانجەیاندا دەیەها کتێب و هونەرمەندیان بەکار هێنا، لەگەڵ سەدەها شانۆگەری و فیلم و زنجیرە فیلم و رۆژنامە و گۆڤار و نادی و سەندیکاکان و ناردنە دەرەوەی سەدەها لاو بۆ دەرەوە، ولات بەبێ سوپا بوو بە بەندە و کۆیلەی ئەوان، دەستیان دایە بڵاوە پێکردنی گەندەڵی لە خورەوشتدا و سوتاندنی بەها و نەریتی جوان کە لە ئایینە پاکەکەمانەوە پێمان گەیشتبوو.

ئەوەش کە ئێستا دەبینرێت لە بێ لەچکی و جلی رووت و ناشەرعی بەرهەمی ئەو شالاوە رۆشنبیریەی ئەوانە کەلەدوای روخانی خەلافەتەوە دەستیان پێ کردووە و تاوەکو ئێستاش بەردەوامە.

بۆیە پێویست بوو لەسەر چاکەخوازان شتێك بکەن بۆ وەستاندنی خوێنی ئەو برینە قوڵە کە دوچاری بەها و نەریتمان بووە، ئەم کارەش (ئەم کتێبە) کۆششێکە لەو کۆششانە و گەڕانەوەیەکە بۆ رەسەنایەتی و وازهێنانە لە زەلیلی و ملکەچی و شوێنکەوتنی کافران.

**ئەم نامیلکەیە:**

تایبەتە بە توێژێکی کۆمەڵگاکەمان کە ئەوانیش ئەو خوشکانەن کە بە پۆشاکی شەرعییەوە پابەند نین، ئەوەش یان لەبەر ئەوەیە نازانن باڵاپۆشی ئەرك و واجیبە، یان لە بەرانبەر بریق و باقی دونیادا لاوازن، یان لە بەرانبەر دەروونیی خراپخواز و شەیتانی واسواسەکەردا خۆ ناگرن، یان لە بەرانبەر ئەو هاوەڵە خراپانەدا (کە خەیر و چاکەیان بۆ دۆستانی خۆیان ناوێت) لاوازن، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر...